چاپی دووەم

خالید بێر تۆغروڵ

# تەنها دایکم خۆشیویستووم



هاواری ڕۆڵەیەک







ناوی کتێب: تەنها دایکم خۆشیویستووم
هاواری ڕۆڵەیەك
نووسەر: خالید ئێرتوغروڵ
وەرگێڕ: گەشبین طارق نەجیب
بەراوردکردنەوە: تارا محمد
داڕشتنەوە: بەفراو جمال

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٠١٢)ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

# بەشی یەکەم



**ناوم "ئازاد"ە.**

**ئەمە چیرۆکی ژیانمە.. ژینێکی نامۆ..**

**ئاهی عەشق و، بێ وەفایی و پەشیمانی...**
**سەرگوزشتەیەکی سەرسامکەر و،**
**بێ وێنە و، لێوان لێو بە ئەسرین و**
**تاڵ و سوێرییەکانی ڕۆژگار....**

**گەنجێکی بێ نەوا و بێ چارە بووم، لە دەمەو بەهاری ژیانمدا بووم. هەرگیز بە خەیاڵمدا نەهاتبوو ببمە خاوەنی میراتییەکی زۆر و، دەوڵەمەند ببم، بەڵام ئەو سامانە حازربەدەستەم لەگەڵ هەستی لەخۆبایی بوون و چەواشەبوونم بوونە هۆی ئەوەی خۆم لەنێو جیهانێکی سەرسوڕهێنەردا بدۆزمەوە!**

**ئەو سەرکەشیی و بێباکییەشم هۆکاری هەڵوەرینی چرۆی ژیانم بوو.**

ئەو کەسەی هەردەم چاودێر و خەمخۆری هەناسەساردم بوو لەو سەردەمانەی خەیاڵ پڵاویمدا، تەنها دایکە بێچارەکەم بوو، کە هەموو ڕۆژێك لێم دەپاڕایەوە و تکای لێ دەکردم هەست بەو مەترسییانە بکەم کە دەوریان تەنیوم.. بەڵام ئەفسوس.. هیچ بایەخێکم بۆ تکاکانی دانەنا و، بەهۆی منەوە دڵە زیزەکەی –کە چەندین جار وردوخاشم کردبوو– ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژاکاوتر دەبوو...

لەسەروبەندی تاوسەندنی ئاگری خەمخۆریی و سۆزی دایکم، میوانێکی چاوەڕواننەکراو لە دەرگامی دا و، هێندەم زانی تارمایی نەخۆشی و مەرگ ژیانیان لێ تاڵ کردم!

بە ئازارترین مۆتەکەی ژیانم لەو ساتەوە دەستی پێکرد کە لە ژوورێکی ساردوسڕی نەخۆشخانەدا خۆم بینییەوە، دیار بوو پاسەوانە تایبەتەکانم گەیاندبوومیانە ئەوێ. پزیشکە تایبەتەکەشم بە فایلەکەی بندەستییەوە هەوڵی دەدا بە ئاسانترین شێوە تێمبگەیەنێت نەخۆشییەکەم گەیشتووەتە خراپترین قۆناغ.

لەڕاستیدا ئەو پەشۆکان و بێزارییەی کە بە ڕووخسارییەوە دەبینرا، زمانحاڵی سەختیی بارودۆخ و نەخۆشییەکەم بوو.

پاش چەند ساتێك لە هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی فایلەکە، بەدوودڵییەوە چاوی لە چاوم بڕی.. دیاربوو کە نەیدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکات و، بە چ جۆرێك هەواڵەکەم پێ بدات، هێز و بوێری

ئەوەی نەبوو چاو لە چاوەکانم ببڕێت، بەڵام من تێگەیشتبووم.

لەکۆتاییدا سەری داخست و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی:

– بەپێی ئەنجامی یەکەمین پشکنین ...

ئـیتر بێـدەنگ بـوو.. قسـەکەی بـە تەواونـەکراوی بەجێهێشـت.. لەڕاستیدا پێویستی نەدەکرد تەواوی بکات.

بـە بیسـتنی ئـەو هەواڵـە جـەرگبڕە کۆشـکی هیـوا و خۆزگـەکانم ڕووخا، هەناسەکانم لە گەروومدا قـەتیس بـوون، واتـە شـەمەندەفەری تەمـــەنم هێــواش هێــواش لـــە دوا وێســـتگەی نزیــك دەبێتـــەوە؟!. بیرکردنەوە لە تـەنگوتاریی و سـامناکی گـۆڕ وەك ئـەژدیها لـە گـەردنم ئاڵابوو.

دکتۆر و پەرستارەکانیش دەوریان دابووم و، بە ترس و بەزەییەوە لێیان دەڕوانیم....

لەناکاو بەرچاوم لێڵ بوو و، هۆش و ژیـریم لای خـۆم نـەما.. زۆری نەمابوو دڵـم بـە لێـدان و زرمـەی سینەم کـەرت بکـات، گوێیەکانیشـم بەشـێوەیەك قـورس بـوون کـە ئـیتر هیچـم نەدەبیسـت و، توانـای بەرەنگاربوونەوەم نەما!

تارماییـــەکانی تـاریکی دەوریـان تـــەنیبووم .... (واتــە ئـیتر مـن دەڕۆم)!.

** **

(من)ێـك، بـێ ڕشـتنی ئـارەقی نێوچـاوان دەوڵەمەنـد بووبـووم، گەنجێکی بێباك و خوێنگەرم بووم، کـە لـە دەریـای هـەواو ئـارەزوو و ڕووکارە چەواشەکارەکاندا فریوم خواردبوو و، وەك ئـاو پـارەم خـەرج دەکرد.

گەنجێکی سەرکەش بووم، کە بیروڕای هیچ کەسم لا گرنگ نەبوو.. بـێ ئاگایـەك بـووم کـە نـە ئاگادارکردنـەوەی دڵسـۆزان و نـە تکاکـانی دایکمـم بـە هەنـد وەردەگـرت، تەنانـەت تاقـەتم نـەبوو گوێیشـیان لـێ بکرم.

لاوێك بووم، کە ئالوودەی جوانی و ڕووکارەکانی دونیا بووبووم و، نەمدەویست بێ دڵیـی خـۆم بکـەم. بەوپـەڕی بێئاگـایی و بـە خـەیاڵی چێژوەرگرتن لە هـەموو شـتێك لـە جـوانی و بـاقوبریقی ئـەم دونیایـەم دەڕوانی.

ڕۆڵەیەکی بـێ ڕەوشـت و لاسـار بـووم بـۆ دایکـە بەسـتەزمانەکەم، ئەوانەی ئاگاداری ئەو هەلانەی من بوون بـە بـەردەوامی ئامۆژگارییـان دەکردم:

– ڕۆڵە مەکە! وەرەوە سەر خـۆت! هـیچ یارێـك هێنـدەی (دایـك) خۆشەویست نیە.

– ئەوەی دایکی بڕەنجێنێت، ئەوا خواش لە خۆی دەڕەنجێنێت.

– ئەوەی دایکی دوعای لێ بکات، سەرکەوتوو و کارڕاست و ساڵح نابێت.

- کوڕەکەم، ئاکامی منداڵی لاسار باش نابێت!

بەڵام من هیچ باکم لەم قسە و ئامۆژگاریی و خەمخۆریی و بەزەییەی خەڵکی نەبوو و، نرخێکم بۆ دانەدەنان.

قسە دووبارەکانیان لام وەك گیزەی مێش بوو و، بە ئامۆژگارییەکانیان ناڕەحەت دەبووم، بگرە لە دڵەوە پێکەنینم پێیان دەهات.

بەڵێ، لە ژیانمدا هەڵەی زۆرم کردووە و، خۆمم گرفتاری زۆر ڕێی چەوت کردووە، بەداخەوە تەنها کاتێك پەیم بەم هەڵانە برد کە کارلەکار ترازا بوو!

دایك، ئەمانەتێکی پیرۆزە..

دایك.. ئەمانەتێکی بەنرخە..

ئاخ، چۆن بمزانیایە!

دەبو لەکوێوە بمزانیایە دایك تاجی سەرە!

سارێژکاری هەموو دەرد و زامێکە.

ڕۆڵەیەك چەند بەساڵاچوو بێت، هەر پێویستی بە دایکە.

چەند مایەی داخ و حەسرەتە! ئێستا دڵی چەواشەبووم تازە لەم ڕاستییانە تێدەگات، لەکاتێکدا لە ڕێی لەدەستدانی تەمەنی لاوی و سامانەکەمدام.

ئیتر ئەمەیە چیرۆکی من ...

پیت بە پیت و، خاڵ و فاریزەکانی ئەم سەرگوزشتەیەم، زمانحاڵی باسوخواسەکانمن...

ژیانێك کە زیاتر لە ڕۆمانێکی نەنووسراوە و، چیرۆکێکی بەخەیاڵدا نـــەهاتوو و، گێڕانـــەوەی کابووســـێکی داچـــڵەکێنەر و خنکێنـــەر دەچێت....

ڕەنگە ئێوە و، خێـزان و، دۆســت و، ناسـیاوانتان بەشـێوەیەك لـە شێوەکان خۆیان لەم بەسەرهاتەی منـدا ببیننـەوە و، ئـەوەی بەسـەر مندا هاتووە بەسەر تۆ و ئەوانیشدا هاتبێت... بە گەشـتکردن بـە نێـو کووچـە و کۆڵانـەکانی ژیانمـدا گوێبیسـتی هـاوار و ناڵـەی دەروونتـان بن....

* * *

کاتێك لە نەخۆشخانە هاتمەوە هۆش خۆم، دەستبەجێ وتم: "چیم بەسەردا هاتووە؟ من کێم؟ لەکوێم؟".

لـە سـەروبەندی بـەهاری ژیانمـدا، لـە ئـامێزی نەخۆشـیدا تـاڵاوی پەشـیمانیم چەشـت، چـونکە نێچـیری ڕابردوویـیـەکی پـڕ سەرکەشـی بووم.

وەك شانۆییەك، لەناکاو ترووسکەکانی ڕۆشنایی ژیانم کوژانەوە و، قۆناغێکی نوێ و لێوان لێو بە ئازاری ویژدان و ئاه و ناڵەم هاتە پێش.

# داستانی ئەوینی (دیلان و غەریب)

شارۆچکە بچووکەکەمان، هەرگیز زستانێکی سەختی بەخۆیەوە نەبینیبوو، ئاووهەوایەکی مامناوەند بۆ گەرم و سازگار و دڵگیری هەبوو.

کچە لاوێکی بەڕەوشت و جوان لە شارۆچکەکەماندا بەردەوام ناوی لەسەر زاری خەڵکی بوو. هەر کەس بیبینیایە هۆگری دەبوو، پەری ئاسا دەهاتە پێش چاو، کە دڵی هەمووانی گرفتار کردبوو.

کاربەدەست و، قایمقامە گەنج و ڕێکپۆشەکەی شارۆچکەکەمان و، گەنجانی خوێنگەرم، هەموویان چاویان تێ بڕی بوو و، بێجگە لەو کەسی تریان نەدەبینی. بەڵێنی وایان پێ دابوو کە ڕەت ناکرێنەوە، بەڵام ئەو بەردەوام ئەم وەڵامەی دەدانەوە:

– من ئێستا نامەوێت هاوسەرگیری بکەم!

خەڵکی شارۆچکەکەش هەرجارەو بەجۆرێك ئەم وەڵامەیان لێك دەدایەوە:

– تۆ بڵێی ئەوەندە ساویلکە بێت، قەدری ئەم بەختەباشە نەزانێت کە لەدەرگای داوە؟

– تۆ بڵێی بیەوێت کەسێکی پەری ئاسا و بەئابڕووی هاوشانی خۆی بدۆزێتەوە؟

– ئەگەر وانیە بۆچی قبووڵیان ناکات؟ لەمە زیاتر چی دەوێت؟

هەرکەس ساماندار، یا دەست بە قەڵەم بوو داوای کردبوو... بەکورتی کەسی سەڵت نەمابوو لە ناوچەکەدا داوای نەکردبێت...

– ئەریَ تۆ بڵێی خۆشەویستی هەبێت؟

ئەو خانمە (دیلان) خان بوو، کە پەری خەونی گەنجان بوو.. دین و ئاینەکەی هێندەی دونیا لا گرنگ بوو و، دواتر بووە دایکی شیرینی منیش.

## (دیلان)ی نموونەی ڕەوشت و، (غەریب)ی سەربەرز و جوامێر:

کاك (ئیسماعیل)ی باوکی (دیلان) خان –واتە باپیرم– زیاد لە سەد سەر مەڕی هەبووە، بەڵام پاش ئەوەی تووشی ڕووداوێك بووە و، نەیتوانیوە لەسەر پێی خۆی بڕوات، ئەرکی بەخێوکردنی مەڕەکانی بە شوانێك سپاردووە بە ناوی (غەریب).

(غەریب) وەك ناوەکەی بێکەس و نامۆ و بیَ نەوا بووە و، شوانی مەڕەکان و ڕێبواری شاخ و دۆڵەکانی سروشت بووە...

زەوی ڕەق و تەق و خاکوخۆڵ پێخەفی بووە و، پارچە جلێکی خۆیشی کردووەتە پشتی و سەرین.

سروشتی ئاووهەوای سازگاری چیاکان لانەی بووە و، قۆناغی گەنجێتی بە شوانی بەسەر بردووە، واتە هەمیشە مەڕومالاتی پێش خۆی داوە و، سەگێك –بۆ هاوکاریکردنی– و داردەستەکەی

هاوسەفەری بوون و، کاریگەرییان لەسەر بنیادی کەسێتیی هەبووە.

گەنجێکی باڵابەرز و، لێ وەشاوە و، ئازا و بە جەرگ و، قسەزان و کارزان بووە، هەرگیز دەستی بۆ حەرام درێژ نەکردووە، بەپێی پێویست خۆی لە هەڵە پاراستووە و، تا بڵێیت ڕەوشتبەرز بووە ...

هەمیشە سەربەرزانە ژیاوە و، هێندە نەفسبەرز بووە کە هەرگیز دەستی لە کەس پان نەکردووەتەوە.

باپیرم، لە نزیك خانی ئاژەڵەکاندا ژوورێکی بچووکی بۆ دروست کردووە.

ئەم (غەریب)ە خوێن گەرمەش زۆربەی کاتەکانی بە شوانییەکەیەوە سەرقاڵ بوو، هەرچەندە چەند مانگێکی زستان مەڕوماڵاتەکەی لە خانەکەوە پێش خۆی نەدەدا بەرەو دۆڵ و چیاکان، بەڵام لە هەمان کاتدا بە درێژایی ڕۆژ و بە بەردەوامی چاودێریی دەکردن.

لەو ماوەیەشدا، خۆی لە بینینی (دیلان)ی خانومان بەدوور دەگرت، هەر لەبەر ئەمەش هیچ کات دەرفەت بۆ خەڵك نەدەڕەخسا تا قسەوقسەڵۆکی بێ بنەما دروست بکەن لەبارەی ئابڕووی ئەم خێزانەوە.

ئەگەر لە شوێنێکیشدا بە ڕێکەوت چاوی بە (دیلان)خان بکەوتایە، لە شەرمدا ئارەق لەناوچاوانی دەهاتە خوارەوە و، سەری دادەخست

و، بیّ سیّ و دوو لەو شوێنە دووردەکەوتەوە...

بەو پێیەی (دیلان)خان جوانی جوانـان و سەرسـامکەری هـەمووان بوو، بەڵام (غەریب) ژیانی لەگەڵ مەڕەکاندا بەسـەر دەبرد، ئـەوا ئـەم دوو گەنجە لە دوو جیهانی زۆر جیاواز لەیەکدا دەژیان.

بـەڵام وەرە ئەمـە لـە دڵـی بێچـارە بگەیەنـە! لەڕاسـتیدا خەیاڵـە سەرکەشەکان جڵەو ناکرێن و، هەسـتەکان گـوێ بـۆ ژیریـی و مـەنتیق ناگرن.

چـڕۆکردنی خۆشەویسـتییەك لـە نێـوان دوو کەسـی هێنـدە لەیـەك جیاواز، بە بۆچوونی شوانە غەریبەکە خەونێکە و هاتنەدیی مەحاڵە و، پێویست ناکات لەدووی ڕابکات.

شـــوانێکی بـــێ دارا و دەرەتـــانی وا تـــەنها خۆشەویســـتیی پاکوبێگەردی وەك سامان شـك دەبـات، بـەڵام تەنانـەت ناتوانێـت لای هیچ کەس پەردە لەسەر هەسـتەکانی لابـدات، بۆیـە هەسـتەکانی وەك نهێنییەك لە دڵیدا پاراستووە.

بەردەوام لەناو ئەم بێنە و بەردەیەدا بە دەروونی خۆی وتووە:

"هێی غەریب! هێی غەریبی داماو! تۆ تەنیا شوانێکیت، سـنووری خۆت بزانە! وا دەزانی چیت و کێیت؟ قایمقام، یا بەڕێوەبەر، یا ئاغا؟ نـابینی ئەوانـە هـەموو بەتـەمای (دیلان)خـان بـوون، کەچـی تەنانـەت ئەوانیشی بەدڵ نییە، قابیلە شوانێکی وەك تۆی بەدڵ بێ؟

هەر بیریشی لێ مەکەوە، تۆ بە چ هەقێك دەتەوێ ئەو خانمەی بە پرشنگی نیگای چاوانی دڵی هەموو گەنجانی بردووە، تەنانەت ئاوڕیشت لێ بداتەوە؟ دەتەوێ دنیای لێ تاریك بکەی و، ئاوێزانی ژیانی زیندان ئاسای خۆتی بکەی؟ بۆچی عەقڵ و، مەنتیق و، ویژدان و، میهرەبانیت نییە؟ چۆن دەتەوێ ئاسۆی ژیانی لێڵ بکەی؟ لە خوا بترسە و، واز لەم خەیاڵە منداڵانەیە بهێنە... گەر لەگەڵ کەسێکی هاوشانی خۆتدا هاوسەرگیریت کرد، ئەوکات ڕازی بوویت بە چارەنووس و نسیبت و، شوکرانەبژێری نیعمەتەکانی خوای گەورەت کردووە، بەڵام خۆ ئەو کەسە بدۆزیتەوە و نەیدۆزیتەوە، تۆ هەر شوانە بێ لانەکەیت. کەوایە هۆشیاربە و خۆت فریو مەدە، بەم ژیانەت و، بە تەقدیری خودا ڕازی بە" .

هەموو هەوڵەکانی کاك (غەریب) بۆ سەرکوتکردنی هەستەکانی شکستیان دەهێنا و، دڵی گوێی بۆ عەقڵ و ژیریی نەدەگرت و، نەیدەتوانی چیتر هەستەکانی کپ بکاتەوە....

بەمجۆرە کاکەی شوان بە خەیاڵی (دیلان)خانەوە ڕۆژەکانی بەڕێ دەکرد.

## دڵە پڕ ڕازەکەی (دیلان)خان:

ئەی دەبێت (دیلان)خان دەنگوباسی چی بووبێت؟

ئەو خانمەی کە سەرەڕای جوانی ڕووخساری، بە ڕەوشتبەرزی و ڕاستگۆیی و، سەلاریی و، دڵە پڕ باوەڕەکەی خۆی ڕازاندبووەوە.

لە ڕۆژگارێکدا هەوا و ئارەزووەکانی نەفس دڵ و ڕۆحی کچە لاوەکانیان شێواندبوو، (دیلان)خان لەهەموویان بەری بوو، تەنانەت دڵی لە پاکوبێگەردیدا دەدرەوشایەوە.

هەرچۆنێك بێت ئەویش مرۆڤێکە و، لە گۆشت و ئێسقانە، بەڵام هیچ کام لە قایمقام، یا بەرپرس، یا ئاغا و پیاوە دەستڕۆیشتووەکانی لا پەسەند نەبوو، بەڵکو (غەریب)ی شوانی بە شایستەی دڵی خۆی دەزانی.

شوانێکی بەستەزمان و بێ پشت و پەنا و بێ داهاتوو و، (غەریب)ێکی دەربەدەری شاخ و کێوەکانی لەهەموو خوازبێنیکارەکانی پێ باشتر بوو. وەکو ئەوەی دەستێکی شاراوە هەموو مەحاڵەکانی لەپێش چاوی لادابێت....

باشە دەبێت لەبەر چی (غەریب)ی هەڵبژاردبێت؟ پلەوپایەکەی؟ یان ڕەوشتبەرزی و دەستپاکییەکەی؟ یان سەلاری و لەسەرخۆییەکەی؟ یاخود کارزانی و ڕاستگۆییەکەی؟ ئەمەش بۆخۆی باسێکە..

سەرەڕای هەموو نشێویی و سەختییەکانیش، عەشقێکی بێ ناونیشان لە باخی ئەو دوو دڵەدا چرۆی کردووە!

ئیتر خۆشەویستی ئاوایە! خۆ هەستەکان لا لە ئاگادارکردنەوەی ژیری ناکەنەوە، کەواتە ناتوانین لە هۆکاری لەدایکبوونی ئەم هەستانە تێبگەین.

ئەوان بێ یەکتر بینین، بێ بەیەکەوە دووان، بێ لێك نزیك بوونەوە، تەنانەت بێ خستنەڕووی ئاماژەکانی هەست و سۆز تەنها بە نیگا پڕ ڕازەکانیان داستانی عەشقیان هۆنیوەتەوە...

تەنیا بە ترپەکانی دڵ و، ناڵەی هەستەکانیان زۆر بە سادەیی و، سەلاری و، پاکوبێگەردانە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووە...

خۆشەویستییەکی دوور لە تەماع و نیازی ناپاکانە، کە وەك کۆرپەیەکی دڵپاك هاتە دنیاوە...

هەرچەندە کۆسپ و بەربەستی زۆر چاوەڕواننەکراو بۆ خامۆشکردنی پشکۆی ئەم عەشقە ڕیزیان بەستووە، خۆ خوازبێنیکارەکانی (دیلان)خانیش نەدەسرەوتن.

ڕۆژانی زۆر سەخت و تار لە ڕێی ئەم هەستانەوەدا ڕیزبووبوون!

لە ڕۆژانێکی تێکشکێنەردا سەرگوزشتەی دوو گەنجی پاکداوێن و، دوو دڵی بێ چارە نەخشێنرا، کە بە ڕووی گەردەلوولی هەڕەشە و نەهامەتییەکانی ڕۆژگاردا وەستانەوە، ئای ئەوانە چ دەردی سەرییەك

بوون، کە عەشقی ساوای (غەریب و دیلان) لە ئاستیاندا زرێی پۆشی بوو!

## مرۆڤی ستەمکار!

کاک ئیسماعیلی باوکی دیلان خان، پیاوێکی نەرمونیان و میهرەبان بوو، دڵی هەمووانی ڕادەگرت، بۆیە تا بڵێیت لەبەر دڵان بوو.

لە پاش مەرگی هاودەم و هاوسەرە خۆشەویستەکەی، هەموو ژیانی خۆی بۆ پەروەردەکردنی (دیلان)ی کچی تەرخان کردبوو، هەوڵی دەدا باوکێکی میهرەبان بێت و هەموو ئارەزووەکانی کچە تاقانەکەی بهێنێتەدی، هەر بۆیە ئەو هەموو خوازبێنیکارە ساماندار و پلەدارانەی کچەکەی بەڕێ دەکرد و، بێ ڕەزامەندی ئەو گفتی بە هیچ کامیان نەدەدا؛ چونکە خواست و بەرژەوەندی ئەوی لەبەرچاو دەگرت.

پاش ئەوەی دووچاری ڕووداوێك بوو، زۆرترین کاتی لە ماڵەوە و لەگەڵ کچەکەیدا بەسەردەبرد و، هاوخەم و هاودەمی یەکدی بوون و، دڵی یەکتریان دەدایەوە ...

تاڕادەیەك هەستی بەو پەیوەندییە بێگەردەش کردبوو، کە لەنێوان دیلان و غەریبی شواندا چرۆی دەکرد، بۆیە وەڵامی بۆ هەر کەسێك دەهاتە خوازبێنی کچەکەی: "کچەکەم خۆی دەزانێ" بوو و،

بەوجۆرەش خۆی لە بابەتەکە بێ خەبەر دەکرد.

بەڵام دەمەو ئێوارەیەك چەند ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراویان لەپێش بوو.

(دیلان)خانی باڵابەرزی، گەنمڕەنگی، ڕۆحسووك سەرقاڵی ئامادەکردن و پێچانەوەی ژەمەخوارنەکەی غەریبی شوان بوو، کە پاش کەمێکی تر دەگەیشت.

کاك ئیسماعیل لە پاش ئەو ڕووداوەی بەسەری هاتبوو چیتر نەیدەتوانی زۆر بجووڵێت، بەو حاڵەشەوە -سەرەڕای ئەوەی هەموو کات سکاڵای زیادبوونی کێشی (قەڵەوبوونی) دەکرد- لە دەستنوێژ گرتن سڵی نەدەکردەوە.

بەر لە تەواوبونی سەدای بانگ -کە ئاوێزانی کەشی فێنك و دڵگیری خۆرئاوا بوون بووبوو- لەدەرگا درا. لەناکاو لێدانەکانی دڵی دیلانیش زیادیان کرد، چونکە وایدەزانی غەریبی شوانە.

بەو هیوایەوە دەرگاکەی کردەوە، بەڵام لە بەرانبەریدا پیاوێکی برۆپان و ڕووگرژ و پەست -کە بێزاری لێ دەباری- لەشێوەی هەڕەشەدا و بە تووڕەیی پرسی:

- ئێرە ماڵی ئیسماعیل ئەفەندییە؟

ئاوازی دەنگی ترسێنەر و شەڕانگێزانە بوو، ڕاستەوخۆ دیلان خان هەنگاوێك هاتە دواوە و وتی:

- بەڵێ ئێرەیە.... خێرە؟ شتێك بووە؟

بەڵام ئەو پیاوە گرژومۆنە هەر بەو شێوەیە وەڵامی دایەوە:

- لەمە زیاتر چی بێت!

دەموچاوی زیاتر گرژ کرد، وەکو ئەوەی هەواڵی بەڵایەکی زۆر گەورەیان پێ ڕابگەیەنێت.

- سبەی (جەبار) ئاغام یەت بۆ سەردانتان.

کاك ئیسماعیل کە گوێی لە قسەکان نەبوو، لە ژوورەوە هاواری کرد:

- ئەوە کێیە کچەکەم؟

- باوکە گیان، وابزانم میوانمان دێت.

کاتێك کاك ئیسماعیل -کە دەرگای ماڵی هەمیشە بۆ هەموان لەسەر پشت بوو- گوێی لە وشەی (میوان) بوو بێ ئەوەی بزانێت کێیە، وتی:

- با بفەرموون کچەکەم، با بێن.

ئەو پیاوە شەڕەنگێزەش بێ هیچ کاردانەوەیەکی شیاو لە ئاست پێشوازییەکەیاندا، ڕووی وەرگێڕا و، ملی نا ڕۆیشت.

دیلان خان خورپەیەك بەدڵیدا هات، هەستی کرد شتێك لە ئارادا هەیە؛ چونکە نە ئەو کەسەی هەواڵەکەی هێنا ئاسایی بوو، نە خودی هەواڵەکەش .....

باوکی کە دەرکی بە ئەندێشەکانی ئەو کرد پرسی:

– خێرە کچی خۆم، شتێك بووە؟

دیلان ویستی باوکی هەست بە گومانەکانی نەکات، بۆیە وتی:

– باوکە، جەبار ئاغا کێیە؟

نیگا پڕمیهرەکانی کاك ئیسماعیل لەناکاو لێڵ بوون، ئەندێشەیەکی نائارامیی جێی زەردەخەنە شیرینەکانی ڕووخساری گرتەوە:

– ئاخر کچم، ئەم جەبار ئاغایەت لەکوێ بیستووە؟!

– میوانەکەی سبەینێمان، ئەو دەبێ.

کاك ئیسماعیل وەکو هەواڵێکی زۆر جەرگبڕی بیستبێت، بە تاساوییەوە وتی:

– ها؟ جەبار ئاغا؟!

کاتێك دیلان باوکی بەم حاڵە بینی، گومانی لا دروست بوو و، بەمەراقەوە وتی:

– باوکە، چی بووە؟

باوکیشی نوقمی خەیاڵێکی قووڵ بووبوو..

لەکاتێکدا کچ و باوك سەرقاڵی ئەم باسوخواسە بوون سەبارەت بەم میوانە نەخوازراوە، دەنگی دەرگا هاتەوە، ئەم جارەیان لەجیاتی دیلان خانی شەرمن، کاك ئیسماعیل هاواری کرد:

– هاتی غەریب گیان؟

لەناکاو هەوری ئەندێشەکانی ڕووخساری دیلان خـان ڕەوینـەوە و، گۆناکانی وەك گوڵی بەهاری گەشانەوە.

(غەریب)ی شوان نەیدەویست لەگەڵ دیلان خان ڕووبەڕووببێتەوە، بۆیـە سـەری داخسـت، لـە دەنگـی لەرزۆکیشـیدا دوودڵـی هەسـتی پێدەکرا، بەوجۆرە وەڵامی دایەوە:

– مامە گیان، ئیشێکم پێتان هەبوو.

کاك ئیسماعیل کە ئەوی بەو جۆرە بینی، بەپێی ئـەزموونی ژیـانی خۆی شتێك حاڵی بوو:

– وەرە ژوورەوە ڕۆڵەکەم، وەرە کوڕم، بـا بـە دڵـی خۆمـان قسـە بکەین.

ئەو دەیزانی قسەکانی غەریب لە دوو ڕستەدا جێگەی نابێتەوە.

غەریبی شوان، بەو حاڵەی دڵیەوە، بوێری ئەوەی نەبوو پێ بنێتـە ماڵیانەوە و، وتی:

– ئاغام، من لە خوارەوەم، ئەگەر کاتتـان هـەبوو بـا تۆزێك قسـە بکەین.

ئـەو (خوارەوە)یـەش هۆدەیـەکی بچـووکی نهـۆمی ژێـرەوەی خانووەکە بوو، کە لە نزیکی خانی مەڕەکان بوو.

ئەم شوانە بەئابڕووە هەر کە دەگەیشتە ماڵەوە، بە هیچ جۆرێك لە ژوورەکەی نەدەهاتە دەرەوە، هەرگیز بـێ مۆڵـەت خواسـتن، یـان بـێ

ئەوەی بانگی بکەن نەدەچووە قاتی دووەم، واتە ماڵی کاک ئیسماعیل.

لەو کاتانەشدا لە دەرگای دەدا، داواکارییەکەی بە کورتی دەوت و دەگەڕایەوە ژوورەکەی.

کاک ئیسماعیل وتی:

– نانا، دیارە شتێکی گرنگە، دەنا تۆ لەم کاتەدا لە دەرگات نەدەدا.. وەرە با تۆزێك قسە بکەین.

غەریب هێندە بەشەرم و ڕەوشت بوو کە هەرگیز لەسەر قسەی گەورەکان زۆر نەدەڕۆیشت، بۆیە چووە ژوورەوە.

بەڵام لەبەر ئەو هەستەی هەیبوو بەرانبەر دیلان خان، چین چین ئارەقی دەڕشت. لەناکاو لەگەڵ دیلان خاندا نیگاکانیان بەریەك کەوتن.

کاک ئیسماعیل دەستی بۆ بەشی سەرەوەی ژوورەکە ڕاکێشا و وتی:

– دانیشە کوڕەکەم.

غەریبی شوان –کە لە شەرمدا دەست و پێ سپی بووبوو– لای دەرگاکە دانیشت.

– کچەکەم، پێش نوێژی ئێوارە چایەکمان بۆ لێ بنێ، با لەگەڵ غەریبی کوڕمدا بیخۆینەوە.

وەکو ئـەوەی چارەسـەری هـەموو دەرد و ناخۆشـییەکان بـە یـەك پیاڵە چا بێت.

دیلان –کە بە پاکوخـاوێنی و کـەیبانوویی ناسـرابوو– لـەو کەشـە ئارامەدا وەك پەروانە دەستبەکار بوو.

ئەو خانمەی وەڵامی هەمووانی بە (نەخێر) دەدایەوە، ئێستا چا بۆ غـەریبی شـوان لێ دەنێـت! وەك ئـەوەی میوانـداریی شـازادە بکـات، هێنــدە دڵئاســوودە بــوو، هەســتی دەکــرد شــاهانەترین کــەس میوانیەتی...

غەریبی شـوان بـاوەڕی نـەدەکرد شـاجوانی خەونـەکانی چـای بـۆ ئامادە دەکات، بۆیە دەستەکانی دەلـەرزین، شـانەکانی مانـدوو و بـێ حەواس و، دڵی لە سینەیدا بەتوندی لێی دەدا، زۆری نەمابوو لە هۆش خۆی بچێت.

لە هزروبیر و خـەیاڵی هەریـەك لـە بـاوك و کـچ و، غـەریبی شـواندا خولیا و خەیاڵ و بیرکردنەوەی جیاواز هەبوو...

چاییەکەیان خواردەوە و، نوێژی ئێوارەشـیان بـە کۆمـەڵ ئـەنجام دا.. غـەریبی شـوان دەیویسـت ئـەم شـوێنە دڵفڕێنـە جـێ بهێڵێـت و، بگەڕێتـەوە لانـە بچـووك و سـادەکەی خـۆی، بۆیـە کاتێـك بـۆ مۆڵـەت خواستن سەری بەرز کردەوە، دووبارە نیگاکانی دوو عاشقەکە تێکـەڵ بـووەوە... بـەڵام سـەری داخسـت بۆئـەوەی بێئـەدەبی نـەنوێنێت،

کۆنترۆڵی هەستەکانی خۆی کرد.. لە دڵی خۆیدا وتی: "خودایە، ئەگەر خێری تێدایە ئەم بەندەیەم لە چارە بنووسە، گەر خێریشی تێدا نییە، هاوسەرگیری ئەوم لەگەڵ کەسێکی تردا پیشان مەدە، چونکە ناتوانم بەرگەی ئەو چارەنووسە بگرم، هیچ نەبێت پێش مەرگم نەیکەیتە نسیبی کەسێکی تر...".

وەکو ئەوەی دیلان خانیش هەمان هەستی هەبێت زەردەخەنەیەکی کرد.. لەڕاستیدا لە دڵی ئەمیشدا هەر ئەو گەردەلوولانە هەبوون و، دەیوت: "بە ئیزنی خودای گەورە ... یان بە تۆ دەگەم، یان هەتا دەمرم پارێزگاری لەم عەشقە دەکەم".

ج خەیاڵاتێك!

**ئەم عەشقە بۆنی مەرگی لێ دێت!:**

کاك ئیسماعیل، ڕووی لە غەریبی شوان کرد و وتی:

– ڕۆڵەگیان، ئارامم نەما، ئەم بابەتە گرنگە باس کە و، ئینجا بڕۆ.

غەریبیش سەرێکی بادا –کە هێشتا لەژێر کاریگەری بارودۆخەکەدا بوو– بەو دوودڵییەوە دەستی بە ڕیزکردنی وشەکانی کرد، سەرەتای قسەکانیشی ناوی جەبار ئاغا بوو.

کاك ئیسماعیل کە ناوی جەبار ئاغای بیست، دیسان ڕەنگی گۆڕا، برۆکانی لێك نا و وتی:

– جەبار ئاغا؟ پێم بڵێ ئەو نامەردە چی کردووە؟

– کاتێك دەمەو نیوەڕۆ مەڕوماڵاتەکەم دەهێنایەوە، پیاوەکانی جەبار ئاغا ڕێگەیان پێ گرتم.

– ئێ؟

نیگا هەست بزوێنەکانی دیلان خانیش، بە بیستنی ناوی جەبار ئاغا بوونە ئەندێشە و ترس و، باسی ئەو (جەبار ئاغا)ناوە زەینی ئاڵۆز کردبوو.

هەستێکی زۆر نائاسوودەی هەبوو سەبارەت بەو ناوە، بێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانێت بە بیستنی خورپە بە دڵیدا دەهات.

غەریبی شوان بە وتەی پچڕ پچڕ بەردەوام بوو:

– نازانم چۆن باسی بکەم.

لەو کاتەشدا هەستەکانی لە ڕووخساریدا ڕەنگیان دایەوە و، چاوە ماندووەکانی پڕ بە ئەشك بوون، بۆ پێشگرتنیش لە هاتنەخوارەوەی فرمێسکەکانی، ماسولکەکانی دەموچاوی گرژ دەکرد.

ئا لەم کاتەدا کاك ئیسماعیل وتی:

– باوکەکەم، هەموو شتێکم تێبگەیەنە، خزم و کەس بۆ کاتی ئاوا نەبن بۆ کەی؟ کەواتە باشتر وایە بنج و بنەوانی کێشەکەتم بۆ باس بکەی.

کاك ئیسماعیل و دیلان خان، بە پەرۆشەوە گوێیان بۆ غەریب گرتبوو، چونکە دەیانزانی گەر بابەتەکە زۆر گرنگ نەبوایە، لای ئەوان

باسی نەدەکرد، ئاخر ئەو بەستەزمانە هەمووکات خۆی کێشەکانی خۆیی چارەسەر دەکرد.

– پیاوەکانی جەبارئاغا تەنگیان پێ هەڵچنیم. دەستیان نایە بینەقاقام، تا بمخنکێنن.

کاك ئیسماعیل لەوە زیاتر نەیتوانی ئارام بگرێت و، بە هاوارەوە وتی:

– بۆ؟ ئەو نامەردانە چیان لە تۆ دەویست؟

غەریبی شوانیش بە تەواوی بێچارەییەوە سەری داخست و پاش هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ وتی:

– پێیان وتم .. چوار ڕۆژت بۆ دادەنێین، دەبێ تا جومعە بارگەوبنەت کۆکەیتەوە و، شارۆچکەکە جێ بێڵی، ئەگەر بێیتە بەرچاومان، دەتتۆپێنین.

ئا لێرەیشدا غەریبی بێ چارە چیتر نەیتوانی بەردەوامی بە قسەکانی بدات، هەستی دەکرد وشەکان وەکو چەقۆ گەرووی دەبڕن و، خۆی لە لوتکەی بێچارەیی و بێکەسیدا دەبینییەوە.

کەشێکی غەمگین باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا.

کاك ئیسماعیل وتی:

– ڕۆڵەگیان نیەتی گڵاویان ئاشکرایە.. لەڕاستیدا هیچ بەلامەوە سەیر نەبوو، پێویستیش ناکات خۆتی بۆ بێ تاقەت کەیت، مردن

تەنها بە دەست خوایە و، تا ڕۆژ و ئەجەلت نەیەت کەس ناتوانێ بتترسێنێت پێی، کە ئەو ڕۆژەش هات هەزار پاسەوانیشت هەبێ دادت نایەن.

دیلان خان چیتر نەیتوانی بەرگە بگرێت، بۆئەوەی لە بیرکردنەوە ئاڵۆزەکانی ڕزگاری ببێت وتی:

– باوکە، ئەم جەبار ئاغایە کێیە؟ ئیشی چیە؟ بۆچی دەیەوێ کاک غەریب دەربکا؟

ناوی غەریب ئەوەندە بە شێوەیەکی ئەفسوناوی لە زاری دیلان خان دەرچوو، کە لە گوێی غەریبدا وەکو ئاوازێك دەزرنگایەوە، باشە تۆ بڵێی دیلان خان هەستێکی بۆی هەبێت و پێی خۆش نەبێت ئەم بڕوات؟... لەمێشکی خۆیدا وەڵامی ئەگەرەکانی دەدایەوە: "ناڕۆم بۆ هیچ لایەك، مەگەر مردن من لە تۆ جیا بکاتەوە".

کاك ئیسماعیل وتی:

– باشە غەریب گیان، تۆ دەڵێی چی؟

– منیش لەگەڵ قسەکەی جەنابتاندام، "ئەوەی باوەڕی بە قەزا و قەدەر هەبێت، بە ڕووی هیچ بەڵایەکدا شکستە نابێت"، من بەس لەوە دەترسم، ئەگەر داواکاریەکەیان بەجێ نەهێنم، بەڵایەکتان بەسەرا بێنن.

کاك ئیسماعیل کەمێك لە کچەکەی ڕاما، کە ترس و دڵەڕاوکێ ڕووە

جوانەکەی ژاکاندبوو، پاشان لای کردەوە بەلای غەریبدا و، نوقمی خەیاڵەکانی بوو.

غەریب کاتێ ئەم بێ چارەییەی لە ڕووی کاك ئیسماعیلدا خوێندەوە، وتی:

- ئاخر من منداڵێکی هەتیوو و بێ ناز و ڕەش و ڕووت بووم، کەچی ئێوە خۆتان کردە خاوەنم و، لە قورسترین ڕۆژەکانی ژیانمدا دالدەتان دام. من بە گیان قەرزاری ئێوەم.

تا ئێستا چیم پێویست بووبێ بەزیادەوە خستووتانە بەردەستم، ئێستەیش نۆرەی منە، ئێوە بەس بلێن چیتان بۆ بکەم، تەنانەت ئەگەر مردنیش بێ بە شانازییەوە سەرم لەڕێتانە.

ئەگەر دەلێن: "تووشی بەلایەکمان مەکە و، بڕۆ!"، ئەوا سەر دادەخەم و بێ ئاوڕدانەوە دەڕۆم. ئەگەریش دەلێن: "مەڕۆ، با پێکەوە بەرەنگاری کێشەکان بینەوە!" ئەوا بۆ ئەوەیش سەرم پێوە نییە.

دیلان خان بەو ئاگرەی کە لە دڵیدا داگیرسابوو و بەبیستنی ئەو وشانەش ڕاچڵەکی و لەدڵی خۆیدا دەیوت: "من نە بەرگەی ڕۆشتنت و، نە بەرگەی مردنت دەگرم".

کاك ئیسماعیل وتی:

- ڕۆڵەکەم، من ئەو جانەوەرانە باش دەناسم، کە خەیاڵێك دای

لەسەریان، بە دڵنیاییەوە پێی دەگەن، لە کوشتنی کەسانی وەك من و تۆدا هەر ناسڵەمنەوە و، دەمانکەنە قوربانی دوو فیشەك.

غەریب لەو کاتەدا وتی:

– بەڕای ئێوە، بڕۆم و دەرد و بەڵاتان لێ لادەم باشتر نییە؟

لێرەدا بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا ... تەنانەت دەنگی هەناسەش نەدەهاتە بەرگوێ.

غەریب چاوەڕێی دەکرد کاك ئیسماعیل بڵێت: "نا ڕۆڵە، شتی وا نابێ، بۆ کوێ دەڕۆی؟"، تەنانەت بە خەیاڵی خۆی دیلان خانیش هەمان شتی دەوت.

کاك ئیسماعیل هەمیشە هەموو ئەگەر و مەترسییەکانی بە وردی لێك دەدایەوە، پاشان بڕیاری دەدا، ئەمجارەش لە وەڵام دانەوە پەلەی نەکرد.

– خوا دەزانێ کوڕم، سبەی لەسەر خێر بیرێکی لێ دەکەینەوە، تا ئەو کاتەیش خوا خۆی دەمێنێ و موڵکی.

لەڕاستیدا ئەم هەڵوێستەی لەبەرئەوە بوو کە بە پێویستی نەزانی هەموو شتێك لای غەریب باس بکات، بۆیە بێدەنگی هەڵبژارد.

## خۆ بەدەستەوەدانێکی سامناك!

کاتێك غەریب ڕووخسەتی خواست، بانگی خەوتنانی دەدا.

باوك و کچ دەزنوێژیان تازە کردەوە و، هەموو کێشەکانی ژیانیان

خسته لاوه، تا به دڵ و گیان نوێژەکەیان بکەن.

سەرەڕای ئەو بارە ناهەمواره، لە کەشێکی لێوانلێو لە ئومێددا دەستیان ڕووەو بارەگای خوای میهرەبان بەرز کردەوە و، نزایان کرد ئەو زاتە ڕێگەچارەیەکیان بێنێتە ڕێ.

وەك هەمیشە پاش ئەنجامدانی نوێژەکەیشیان، لە کەشێکی ئیمانیدا، لە ئایەتەکانی قورئاندا قاڵ بووبوونەوە.

ئەم خێزانۆچکە سادەیە لەگەڵ ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی ئایەتە شیرینەکان لەلایەن کاك ئیسماعیلەوە، لە دەرمانخانەی ئیلاهیدا زامە دەروونییەکانیان تیمار دەکرد و، ئەو کەشە ڕۆحانییەش بەتەواوی ئەوانی لە جیهانی ماددیاتی دونیا دابڕیبوو.

## نهێنییەکانی ڕابردوو:

دیلان خان -سەرەڕای گوێگرتن بۆ وتە شیرینەکانی باوکی و ڕۆچوون لە گفتوگۆکەیاندا- لەناکاو ڕووداوەکەی هاتەوە یاد و، وتی:

- بابەگیان.. مەستەکەم قسەکانت پڕن لە ڕازونیاز، بۆ پێم نالێی ئەو جەبار ئاغایە کێیە؟ پیاوەکانی چیان لە ئێمە و غەریب دەوێ؟ خۆ دەبێ ئەمە هۆکارێکی هەبێ! من دەڵێم دەیانەوێ ساردی نێوانتان نەهێڵن و، سەردانمان بکەن.

- ئای! کچە جوانەکەم، ئاخر تۆ تا ئاوا دڵپاك بیت لە ڕق و کینە و نیازی خراپیان تێ ناگەیت، بەڵام کەسانی دەست و دڵ ڕەش و بێ

ویـژدان بـۆ گەیشـتن بـە مـەرامی گڵاویـان پلانـی وا دادەڕێـژن کـە شەیتانیش سەری سوڕبمێنێت لێی.

– بابەگیان.. دیسان بە جفرە قسـە دەکـەی، تکایـە ڕوونـتر قسـە بکە.

– سوودی نییە ڕۆڵـە.. کـاتی ئـەوە هـاتووە بـۆت بـاس کـەم. لـە منداڵیتـەوە پرسـیار لەسـەر ڕابـردوو و دایکـی ڕەحمـەتیت و ژیانمـان دەکـەی، بـەڵام مـن دانم بەخۆمـدا دەگـرت و، چـاوەڕوانی ئـەو ڕۆژەم دەکـرد، کـە هێنـدە فـام بکەیتـەوە، بتـوانی بەرگـەی بیسـتنی ئـەو بەسەرهاتە بگری.

ئەوەی ڕاستی بێ، حـەز ناکـەم ئێسـتاش بـۆت بـاس کـەم، بـەڵام مادام جەبار ئاغا دیسانەوە هاتۆتە بەر دەرگامان، ئیتر پێویستە تۆش بیناسیت.

خوا ڕەحـم کـا و، ئـەم شـەو بـەخێر تێپـەڕێ، نـازانم ئەگـەر دڵت بەرگەی ئەو ڕووداوە سەختانە بگـرێ کـە لەگـەڵ دایکتـدا بەسـەرماندا هاتووە؟ بەڵام هەر دەبێ بۆت باس کەم.

دیلان خان بە تامەزرۆیی و پەرۆشییەوە گوێی بۆ بـاوکی ڕاگرتبـوو و، هەموو بیروهۆشی لای قسەکانی ئەو بوو....

کاك ئیسماعیل ئاهێکی هەڵکێشا و، کەوتە باسکردنی داستانەکەی خۆی و زەلال خان، هەر وەك ئەوەی دوێنـێ بووبێـت... هێشـتا نـاوی

(زەلال)ی لە زار دەرنەچوبوو، چاوەکانی بە فرمێسک پاراو کرد و، هەناسەی توند بوو و، لێدانەکانی دڵی زیادی کرد. لەناکاو هەستێکی پێناسە نەکراو، هەناوی داگیر کرد.

دیارە کە ئەو ڕابردووە زامێکی سارێژنەبووی ڕابردوو بوو و، هێشتا خوێنی لەبەر دەڕۆیشت و، بە بچووکترین یادکەوتنەوەش هەموو ئاهوناڵەکانی زیندوو دەبوونەوە.

وتی:

– کورتەی وەڵامی ئەو پرسیارەی هەمیشە خۆمم لێ دەدزییەوە: (دوژمنایەتی جەبار ئاغا و عەشقە بێگەردەکەی نێوان من و دایکت)ە.

دیلان خان –کە بینی باوکی چەند بە هەڵچوون و پەرۆشییەوە دەدوێ– وەك منداڵێك سەری نا بە سینەی میهرەبانی باوکییەوە و، ڕوومەتەکانی ماچ کرد.

مۆتەکەی ئازارەکانی ڕابردوو لە گەرووی کاك ئیسماعیلدا پەنگیان خواردبووەوە، بۆیە دوو سێ کۆکەی کرد، پاشان داوای پەرداخێك ئاوی لە کچەکەی کرد.

پاش ئەوەی ئاوەکەی خواردەوە، بەردەوامی بەقسەکانی دا..

ئێمە بۆ ڕۆژێکی وا نەبێت بۆچی باشین ئیسماعیل؟!:

– ئەو ڕۆژگارە باوکی جەبار ئاغا لە ژیاندا بوو، کە ناوی موسا ئاغا بوو، خوا لێی خۆش بێ بەڕاستی پیاوێکی چاك بوو.. هەردەم

چاوێکی لە هەژار و نەدارانەوە بوو.

منیش تازە لە خزمەتی سەربازی گەڕابوومەوە، دایك و باوکیشم وەفاتیان کردبوو، بۆیە پێویستم بە گەورە و سەرپەرشتیکارێ بوو.

لەماڵی دونیا هیچم شك نەدەبرد و، (ئەسپێ لە گیرفانمدا سەوزەڵێ خانمی بوو)، بۆیە چوومە لای موسا ئاغا، وتم بەشکو ئیشێکم بۆ بدۆزێتەوە، هیچ نەبێ سکمی پێ تێر کەم.

ئەویش خوا لێی خۆش بێ، کردمی بە شوانی مەڕەکانی و، پاش ماوەیەك کە لە دەست و دڵم دڵنیا بوو کردمی بە سەرپەرشتیکاری شوانەکانی.

ئەو دەیزانی بێ کەس و بێ دەرەتانم و لەم دونیایەدا غەریبم، بۆیە پاش نیوەڕۆیەك بانگی کردم و، بێ پێچ و پەنا پێی وتم:

– ڕۆڵە، ساڵێکە چاوم لێ غافڵ نەکردووی و، بۆم دەرکەوتووە حەڵاڵ زادەی.

ماشاء الله! ئیش و کارت بە جوانی ڕایی دەکەی، منیش پێویستم بە کەسێکی وەك تۆ سەڕاست و، دەست و دڵ پاك و، ڕاستگۆ و، ئەمینە.. جا دەمەوێ ئیشوکاری مەڕوماڵات و زەرعاتەکەم بۆ بەڕێوە بەری.

هەرچەندە گەنج و تازەپیاکەوتوویت، بەڵام دەزانم لە ئیشوکاری باخ و باخاتەکەمدا درێخی ناکەیت.. دەیشزانم شوان و فەلاحەکانی

دەورت زۆر خۆشیان لەمە نایەت. بەڵام تا خۆمت لە پشت بم، هیچ خەمت نەبێ و، لە کەس نەترسی، سەر بۆ هیچ نامەردێ نەوی نەکەیت و، ئیشی خۆت بە ڕێکوپێکی بەڕێوەبەرە.

بەڵام تۆ هێشتا ژنت نەهێناوە، دەترسم ڕۆژێك بێت لە نیوەی ڕێدا بچی بەلای ژیانی خۆتەوە و، لامان لێ نەکەیتەوە، لەبەرئەوە دەڵێم پێش ئەوەی دارونەدارمت بخەمە دەستتەوە، با زەماوەنێکی بچووکت بۆ ساز کەم، دەڵێی چی؟

من لە پای سۆز و بەزەیی ئاغادا زمانم گۆی نەدەکرد. نازانم چی بە کەسێکی وا میهرەبان و نانبدە بڵێم؟

ئاغا دەستی خستە سەر شانم و، وتی:

– ڕۆڵە، من نامەوێت زۆرت لێ بکەم، بەڵام تۆ پێویستت بە ژنێکی خانومان و حەڵاڵ زادەی وەك خۆتە. منیش بۆ پیاوێکی باوەڕپێکراوی وەك تۆ داماوم...

کەوایە خوای گەورە هەردووکمانی لەم نیەتە باشەدا موحتاجی دەستی یەك کردووە، تۆ ڕازی بە، با ناوی خوای لێ بێنین.

بە چاوەکانی وەکو بڵێت: "تۆ دەڵێی چی؟" بۆ ماوەیەك لێی ڕوانیم ...

لەناکاو وەك ئەوەی بابەتێکی گرنگی لەبیر کردبێت، وتی:

– ئا.. ئەگەر خەمی خەرجی و شتی وایشتە، ئەوا هەر بیریشی لێ

مەکـــەوە، تـــۆ لـــەمڕۆوە دەستەڕاســـتی موســـا ئاغایـــت، هـــەموو خەرجییەکانیش با فیدای سەرت بن.

له خـزم و دۆسـتاندا بنەماڵـەی بـاش زۆرن، کـە ئەصـڵزادە بـن و، کچی شۆخ و شەنگ و بەڕەوشتیان هەیە، جا تۆش کامیانت هەڵبژارد، دەیخوازین و، دواتر دوو هۆدە و هەیوانێکیشتان بۆ پێکـەوە دەنـێین، تا دەکەونە سەرپێی خۆتان و، دوو پوول کۆدەکەنەوە.. ئێسـتە وتـت چی؟

ئاخر چی وەڵامی ئەم پیاوە ڕیش سپی و دنیادیـدە و میهرەبانـە بدەمەوە؟ من چۆن لەڕووم هەڵبێت ڕازونیازی دڵمی لا بـدرکێنم؟ بۆیـە بە شەرمەوە سەرم داخست.

ئاغای میهرەبانم خۆی لە سەروسـیمام حـاڵی بـوو و، وەك باوکێـك وتی:

– سەیر کە، یان .. خۆت کەسێکت لە خەیاڵە؟

منیش چین چین ئارەقی شەرمەزاریم دەڕشت!

بەردەوام بوو:

– شەرم مەکە ڕۆڵە، ئەگەر شتێکی وا هەیە بیڵـێ، هـەر کەسـێکە، لە دەرگایان دەدەین و دەیخوازین.

ئاغا سەرێکی بادا و، ئاهێکی هەڵکێشـا، دیـاربوو هێشـتا لـە دڵیـدا حەسرەتی داستانێکی هەڵگرتبوو.. بەردەوام بوو:

- بیلێ باوکەکەم، ئێمەیش هەنێ لە دڵداری سەر دەردەکەین.

پاشـان چـاوی لـە چـیا بڵنـدەکانی ئـەو نـاوە بـڕی، وادیـاربوو سەردەمانێك ئەمیش گیرۆدەی عەشقێك بووە کە تا ئێستایش لەدڵیـدا حەشاریداوە.. پاشان ڕووی کردە من و، وەکو ئەوەی بیـەوێت بڵێـت: "باسەکەی تۆیش لەوەی من دەچێت" وتی:

- کچەکەیش دڵی پێـوەیە؟

بە ئاماژەی سەر (بەڵێ)م بۆ کرد.

- کەوایە، نابێ سێ و دووی لێ بکەین، بێتو بە نسیبی کەسێکی تر بێت، ئیتر دەبێ هەردووکتان بەو ئاهەوە سەربنێنەوە.

دیار بوو ئەمە تەنها بیروڕایەك نیە و تەواو، بەڵکو کسپەی جـەرگی بوو لە ئاگرێك کە گەنجیی سووتاندووە.

کاتێك بینی من هەر بێدەنگم، وتی:

- ماڵی باوکی ناتدەنێ؟!

منیش دووبارە بە ئاماژەی سەرم (بەڵێ)م کرد.

- بۆچی؟

زۆر بە شەرم و تەریقییەوە ناچار کەوتمە گۆ:

- خۆی پێم ڕازییە و، دایکیشی لاری لێ نییە، بەڵام باوکی ...

- باوکی ڕازی نابێ؟

- دەڵێ کچ نادەم بە هەتیو و، هەژار و ڕەشوڕووتێکی وەك تۆ..

بەمیهرەبانییەوە وەکو باوکێك دەستی خستە سەر شانم و، وتی:

– نە هەتیوی، نە هەژاری.. رۆڵە ئەم شتانە لەدەستی کەسدا نییە و، تەقدیری خوای گەورەیە، بەڵام لەمرۆوە نابێ و ناتوانن وات پێ بڵێن، ئێمە بۆ رۆژێکی وا نەبین بۆچی باشین ئیسماعیل؟

بەڕاستی ئەم موسا ئاغایە نموونەی جوامێریی و، لێوەشاوەیی و دەست و دڵ جوانیی بوو!

بەردەوام بوو:

– کوڕی خۆم، من قەت تکام لە کەسدا نەکردووە و، چاو لەدەستی کەس نەبووم، بەڵام ئەمجارە لەبەر تۆ ڕێساشکێنی دەکەم و، لە دەرگای کەسێکی تر دەدەم. ئەگەر بە خۆشی بمان داتێ، ئەوە زۆر باشە، ئەگەر نا ...

ئیتر قسەکەی تەواو نەکرد و، بێدەنگ بوو. دواتر وتی:

– ئاخر گەنجێکی خوێن گەرمی وەك تۆ.. باشە باوکی لەمە زیاتر چی دەوێ؟؟

ئاغا هەستایەوە و، منیش بەدوایدا هەستام و، لەخزمەتیدا وەستام.. وتی:

– سبەی ناوی خوای لێ دەهێنین و، دەچین بۆ خوازبێنی، تۆش ئەمڕۆ هیچ مەکە و، هەنێ بەخۆت ڕابگە.

رۆژ نابێتەوە!:

ئەوە یەکەمین جارم بوو هێندە بە مەراقەوە چاولەڕێی گزنگی خۆری بەیان بم و، ئەوەندە خۆم بە شادمان دەزانی، کە لە هەموو لایەکدا کامەرانییم دەبینی.

بەخۆمم دەوت: "زەلال گیان، چوار ساڵ چاوەڕێت کردم، تەنها یەك ڕۆژی تریش چاو لەڕێم بە".

بەهیچ شێوەك باوەڕم بە خۆم نەدەکرد! لە ئاست هاتنەدیی ئەم ماحەڵەدا هەموو گیانم دەلەرزی، بەڕاستی خوای گەورە موسا ئاغای وەك فریشتە بەفریام خست.

بەخۆڕایی نەیان وتووە: "گەر کەسێکت لەبەر خوا خۆش بووێت ئەوا خوای گەورە نائومێدت ناکات و، پێی دەگەیت".

خوا ئاگاداره، منیش زەلالم لەبەر ڕاستگۆیی و سەلاریی خۆش دەویست.

کاتێك زەلال پێی وتم: "تا ماوم چاوەڕێت دەکەم، گەر بە نسیبی یەکیش نەبین ئەم هەستانەم لە دڵمدا دەنێژم!"، ئیتر منیش زیاتر سووربووم لەسەر ئەو ڕێیە.

دیلان خان لەژێر کاریگەریی وتەکانی باوکیدا وتی: "وای دایە گیان! من نەمتوانی بۆ یەکجاریش هەست بە میهرەبانیی دایکایەتیت بکەم، بەڵام هەرچی لەبارەتەوە دەبیستم بۆنی بەهەشتی لێ دێت".

کاک ئیسماعیل، دڵنەوایی کچەکەی کرد و، بەردەوامی بەقسەکانیدا:

– لەکاتێکدا مێشکم بەو بەزموڕەزمی خوازبێنییەوە جەنجاڵ بووبوو، ڕێم کەوتە ڕێی کوڕە لاسارەکەی ئاغا، کە ناوی جەبار بوو.

لە تەمەنی خۆمدا بوو، –بەناو– خوێنەوار بوو، بەڵام خوێندنی تەواو نەکردبوو. کەسێکی خۆپەرست و، لەخۆبایی و، بەدکار و، شەڕانگێز و، چاوبەردەرەوە و ژنانی بوو ... زۆرینەی کات لەگەڵ باوکیدا ناکۆک بوون.

نازانم بۆ، بەڵام لەوە نەدەچوو خۆشحاڵ بێت بەوەی باوکی سەرپەرشتیی کێڵگەکانم پێ بسپێرێ و، هیچ خۆشی لەم باسە نەدەهات.

کاتێک لای ئاغا هاتمە دەرەوە، لە لای قادرمەکان چاوەڕێی دەکردم.

به شێوەیەکی گاڵتەبازانە وتی:

– ئەوە دیسان لەگەڵ باوکمدا چیتان بەدەستەوەیە؟ ڕەز و باخی هەمووی خستە ژێر دەستت، دەڵێم نەشتکا بە ئاغا باشە!

من بە ڕێزەوە سەرم داخست.. با لە هەمان تەمەنیشدا بین، ئەو هەر بەگزادەیە و، کوڕی ئاغاش لای خۆمان لە جێی ئاغایە. بۆیە وتم:

– ئەستەغفیروڵا ئاغا، ئەوە چ قسەیەکە؟ من هەر فەرمانەکانی

گەورەم جێبەجێ دەکەم.

لەناکاو هاتە بەردەمم:

– سەیر کە، با بزانیت ئەو تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە و، عومری پیرەمەرێکی ماوە، بەکورتی تەمەنی درێژی ساڵێکە، جا هەر چیت پێ بڵێت و چ فەرمانێکت پێ بدا، دێیت پرس و ڕا بە من دەکەیت، تێ دەگەی؟ بێ ڕەزامەندی خۆم دەست ناکەیت بەئاوا، ئەگینا نانت دەبڕم و، دەرت دەکەمە دەرەوە.

منیش دووبارە بەڕێزەوە وتم:

– بەسەر سەر ئاغا.

ڕێگەم نەدا لەوە زیاتر بڕێسێ و، دوورکەوتمەوە... دەمزانی چارەی ناوێم و، لە هەلێك دەگەڕێ شاریەدەرم کا، چونکە چاوی بەرایی نەدەهات ئاوا لەناو خەڵکدا ڕێزم هەبێت.

دەیویست هەر ناوی خۆی لەناوانا بێت.. بەکورتی لە کێچەڵ دەگەڕا!

ئەو شەوە هەر دەم بەدوعا بووم، دەپاڕامەوە: خوایە چی خێری تێدایە ئەوە بێنیتەڕێم.

هەر بە خەیاڵی زەلالەوە بووم و، بە پەیمانەکەیەوە خۆمم بەهێز دەبینییەوە.

چ شەوێکی درێژ بوو! هەستم دەکرد ڕۆژنابێتەوە، تا من بە

مەبەستی خۆم شاد بم، ڕەنگە قەت ئەوەندە چاوەڕێی بیستنی دەنگی (بانگی بەیانی) ڕۆژێکی نوێم نەکردبێت.

لە خانووە قوڕینەکەمدا، بەرماڵە لە پێست دروستکراوەکەم ڕاخست.

بەدڵ دەپاڕامەوە: "خوایە گیان، چی بەباش دەزانی، ئەوە بکەیتە نسیبم، من زەلالم لەبەر خاتری تۆ خۆش دەوێت.. خوایە گیان، ئەم خوازبێنییەمان بە خێر کۆتایی بێنیت". پاشان وەك خووی هەموو بەیانییەکم قورئانەکەم کردەوە و، دەستم کرد بە خوێندنەوەی سوورەتی (یاسین) و، هەوڵم دەدا لە واتاکان تێبگەم و، هەست بە ئاوازی شیرینی ئایەتەکان بکەم.

خۆ ئەگەر ئێمەی مرۆڤ هەمیشە بە دیقەت و تاقەت و سەلیقەوە قورئانمان بخوێندایەوە، هەستمان بە بەندە بوونمان دەرکرد لە حزوری خوای گەورەدا، بیرمان دەکەوتەوە کە بۆ تاقیکردنەوەیەك بەدیهێنراوین و، هەموو پەنهان و ئاشکرامان لای خوای گەورە تۆمار کراوە و، تا تێشوویەکمان بۆ ئەو لێپرسینەوەیە پێکەوە بنایە.

لە سەروبەندی ئەم خەیاڵانەمدا بووم، لە دەرگام درا.

**ئازارێکی پێناسەنەکراو:**

کە دەرگاکەم کردەوە یەکێك بوو لە پیاوەکانی ئاغا و، وتی:

– ئاغا ناردوویەتی بە شوێنتدا ...

بەیەکەوە نانی بەیانیمان خـوارد، چـۆن نـانی بەیانیـەك؟ سـفرەی پاشا! بەڵام چۆن بتوانم بە دڵی خۆم نان بخۆم لەبەردەم ئاغایەکی وا شکۆداردا؟!

وتی:

– کوڕەکەم، دوای نیوەڕۆ ئیشێکی گرنگم هەیـە و، دەبـێ پێـی ڕا بگەم.

با ئەم ئیشەی تۆ پێش نیوەڕۆ بخەین بەلایەکدا.

تەنها قسەکانی بەس بوون بۆ ئەوەی من شاگەشـکە ببم....سـەرم داخست و، وتم:

– بە کەیفی جەنابتان.

لەوکاتەدا جەبار ئاغا هاتەژوورەوە، کە چاوی بە مـن کـەوت، کـێچ کەوتە کەوڵی و، وتی:

– هم، ئیتر لەسەر سفرەی ئاغایت ها؟

کاتێك ئەم قسەیەی فـڕێ دا، موسـا ئاغـا بـە تـووڕەیی سـەیرێکی کرد، بەڵام خۆ جەبار ئاغا لە کەلی شەیتان نەدەهاتـە خـوارەوە، نـەك هیچ لە باوکی نەسڵەمییەوە، تەنانەت هیچ شەرمیشی لێ نەکرد...

وتی:

– دیارە کەتنێکی گرنگتان لەژێر سەردایە.

موسا ئاغا وەڵامی نەدایەوە..

پاش ئەوەی دەستمان لە نانخواردن هەڵ گرت، فەرمانی دا:

– ئەسپەکەم بۆ ئامادە کەن.

کاتێك ئێمە هەستاین بڕۆین، جەبار ئاغا خـۆی هەڵقورتانـدەوە و، وتی:

– دیارە ناتانەیْ ئەم ئیشە گرنگەتانمان بۆ باس کەن.

دووبارە موسا ئاغا وەڵامی نەدایەوە، بەڵام نەیدەویست لـە پـێش چاوی ئێمە لێی تووڕە بێت و، زاری بەست.

جەبار ئاغا ئەمجارەیان ڕووی کردە من و، بەتووڕەییەوە وتی:

– تۆش ....

لەوکاتەدا دەست و پێ سپی بووم و، سەیرێکی موسا ئاغـام کـرد، وەکو ئەوەی بڵێم: "چی پێ بڵێم؟" ...

موسا ئاغا وتی:

– با بڕۆین.

تێگەیشتم کە دەڵێت: "وازی لێبێنە، با هەر بپرسێ، ئەوە ناهێنـێ وەڵامی بەیتەوە" ...

موسا ئاغا و من و دوو پیاوی تر لە دارودەستەکەی ئاغـا کەوتینـە ڕێ.

دوو سـەعات ڕێمـان لـە پـێش بـوو بۆئـەوەی بگەینـە گونـدی (پناریاش).

لەو چلەی هاوینەدا شنەبایەك–وەكو ئـەوەی بیـەوێت كارەكـەمان بۆ ئاسان بكات– فێنكی دەكردینەوە.

هەر كەسێك موسا ئاغای دەبینی سلاوی لێ دەكرد.

جار جار باڵندە بە بەردەمماندا دەفڕی، جـار جـار مـار و، هەنـدێ جاریش چەقەڵ.. ئەم دیمەنانە بـۆ گوندنشینان بووبوونـە بەشـێك لـە ژیانیان، تەنانەت ئەو خەڵكە وای لێهاتبوو كە ئەگەر نەیبینینایـە پێـی ئاسایی نەدەبوو.

لە ڕێدا بوومان بـە دەمەتـەقێ: ئـەم باخـە شـوێنەكەی زۆر باشـە. ئەوەیان وا نییە. ئەم زەویە گەنمی باشی لێ هاتووەتە بەر...

بەلام من لە دڵـی خۆمـدا هەسـتم بـە شـتێكی سـەیر دەكـرد، دڵـی دەگوشـیم، بـێ ئـەوەی هـیچ شـتێكیش لـە ئـارادا بێـت.. لەخۆمـەوە دەموت شتێ من و زەلال لەیەك دەكا.

كاتێ گەیشتینە گوندەكە، هەر مەپرسە چ بێنە و بەردەیـەك بـوو. دیـاربوو خەڵكەكـەی هـەواڵی سـەردانی ئاغایـان بیسـتبوو.. لـەو دەموزەمانـەدا سـەردانی ئاغایـەك بـۆ ماڵێـك زۆر شـتێكی سـەیر و دەگمەن بوو.

خەڵكی ماڵەكە نەیاندەزانی ئێمە بۆ خوازبێنیی كچەكەیان چووین! تەنانەت زەلال هەر نەیشی دەزانی منیشیان لەگەڵدام. سـەردانێكی تـا بڵێیت لەناكاو بوو بۆ خەڵكی گوندی (پناریاش)!

ئاغا لـه ئەسپەکەی دابـەزی و، ئەسـپەکەیان بۆ برد بـۆ شـوێنی حەوانەوە و لەوەڕ.

ئـەو لـە پێشـەوە و ئێمـەش لـەدواوە چـووینەژوورەوە.. خـاوەن مـاڵیش زۆر بـە شـێوەیەکی جـوان پێشـوازی لێ کـردین.. منـیش بـەو بەخێرهاتنە گەرموگوڕە چـاوم چـووبووە پشـتی سـەرم، چـونکە منـی داماو قەت شتی وام بەخۆمەوە نەدیبوو. لەکاتی چوونە ژوورەوەدا من و زەلال چاومان بەیەك کەوت.

نـازانم چـۆن باسـی سەرسـامییتان بـۆ بکـەم! زۆری نـەمابوو لەخۆشـیدا ببورێتـەوە، منـیش هیچـم لـەو کـەمتر نـەبوو، بـەڵام هـیچ نەدەگەیشت بەو سەرسوڕمانەی ئەو، خۆ بەستەزمانە نەیشـی دەزانـی من وەك پیاوی ئاغا لە ماڵیانم؟ یان لەبەر شتێکی تر؟

کـاك ئیسـماعیل لـە دەریـای هەسـتەکانیدا ڕۆچـووبوو و، دیـلان خانیشی هێندەی خۆی سەراسیمە کردبـوو، لـەو کاتـەدا دیـلان وەکـو منداڵێکی بریندار و بێ نەوا لەبـەر خۆیـەوە وتـی: "دایکـە"... لەگـەڵ فرمێسك ڕشتندا وتی: "باوکە گیان، تۆیش بۆنی دایکمت لێ دێ".

کچ و باوك ماوەیـەك لەگـەڵ ئەشـك ڕشـتندا یـەکیان لـەئامێزگرت، بـەڵام کـاك ئیسـماعیل هەرچـۆنێك بـوو بـەو کەسـایەتی و ئـیرادە بەهێزەیەوە، زوو بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و، دڵنەوایی کچەکەی کـرد و، وتی:

- دەزانی ڕۆڵە؟ خوای گەورە تۆی لەجیاتی دایکت بەخشیوە بە من، خۆ ئەگەر ئێستا زەلالمان لەگەڵدا بووایە و، هەردووکتان لە تەنیشت یەکتر دانیشتانەیە، کەس نەیدەتوانی لێکتان جیاکاتەوە.

دیلان خان زۆر بەوە دڵخۆشبوو کە لە دایکی دەچوو و، وتی:

- شەرت بێ منیش وەکو فریشتە ژیانم بەسەر بەرم و، بە شەرەفی ئەوەی کە لە دایکم دەچم، ڕوو لە قاپی خوای گەورە بکەم.

دیلان خان پەرۆشی بیستنی پاشماوەی سەرگوزشتە پڕ حەسرەتەکەی خێزانەکەی بوو، بۆیە بەدەگێکی غەمگینەوە وتی:

- ئێ باوکە گیان.. دوای ئەوە ؟

کاك ئیسماعیلیش بەردەوام بوو:

- خێزانەکەی بە جوانترین شێوە پێشوازیان لێکردین و، هاتن بەدەممانەوە.. چییان شك برد هێنایانە خزمەتی ئاغا.

بە کێك و، بۆرەك و، چۆرەك و چەندین جۆر خواردنی تر سفرەیان ڕازاندبووەوە، وەکو ئەوەی نەك چوار کەس بەڵکو یەك سوپا لەوێ نان بخۆن.

## پارە، ترس، دووڕوویی:

دوای چا خواردنەوە، موسا ئاغای دنیادیدە و ڕیش سپیمان دەستی کرد بە قسە:

- هاتووینەتە خوازبێنیی کچەکەتان بۆ ئیسماعیلی کوڕمان.

بەڵام (بەکر)ی باوکی زەلال ڕەنگی پەڕی، هەموو لایەك هەستمان بە شڵەژاویی کرد. تەنانەت موسا ئاغاش، بۆیە وتی:

– خێرە بەکر، قسەیەکی خراپمان کردووە؟

بەکریش وتی:

– حاشا ئاغا.

– نا نا، دیارە زۆر خۆشحاڵ نیت بەمە، ئەگەر شتێك هەیە بیڵێ.

من لەوکاتەیا بەچاو بۆ (زەلال) دەگەڕام، بەڵام ئەو لە هیچ لایەکەوە دیار نەبوو.

باشە دەبوو پێشتر بیزانیایە کە بۆ داخوازی هاتووین؟ یا ئەویش وەکو من هێندە سەری سوڕماوە و پەشێوە، نازانێت چی بکات ...

لە دڵی خۆما هەرچی دوعام زانی، خوێندم.

بەکر لەبەر خۆیەوە هەنێ مینەمینی کرد و، هەرچۆنێ بوو وتی:

– تۆزێك سەرم سوڕماوە ئاغا.

ئەم جارەیان موسا ئاغا سەرسام بوو بوو و، وتی:

– بۆچی؟

– ئاخر ئاغا، جەبار ئاغای کوڕتان هەواڵی ناردبوو کە هەر دەبێت (زەلال) بۆ خۆی بێت، کەچی ئێستاش ئێوە هاتوون و داوای دەکەن بۆ ئیسماعیل!

هەمووان بەم قسەیە بێ دەنگ بوون.. لەوکاتەدا لەگەڵ موسا

ئاغایا سەیرێکی یەکمان کرد.. هەستم کرد لە داخا ڕەنگی بە ڕووەوە نەما..

ئەوە منیش.. خۆ هەر مەپرسە!

موسا ئاغا وتی:

- بەکر ئەفەندی، هەموو کەس دەزانێت کوڕەکەی من چۆنە، باشە تۆ چۆن باوەڕ بە قسەی ئەو دەکەی؟ خۆتان باش دەزانن خۆ خوازبێنی منداڵبازاڕ نییە و، ڕێ و ڕەسمی خۆی هەیە. ئەگەر جەبار بەڕاستی بووایە، من هەر هەواڵێکم لێی دەبوو و، دەستێکم تێ دەخست.

چۆن ئەم کەینوبەینە بووە و، خەبەرێکت بە من نەداوە؟ لای خۆی باوکی بووکێیت؟

دیار بوو بەکر لەگەڵ جەبار ئاغادا ڕێکەوتبوون، چونکە وتی:

- ئاغام، قسەکانت جوانن، بەڵام جەبار ئاغا دڵی داوە بە کچەکەم، چۆن دەکرێ دڵی ئەو بشکێنم؟

موسا ئاغا پیشی خواردەوە و، وتی:

- بەکر ئەفەندی، من کوڕی خۆم باش دەناسم، سەر لە دڵ و دڵخوازیی و شتی وا دەرناکات، ئاخر چۆن دەبێتە زاوایەکی باش بۆت؟ ئەگەر هەر بەڕاستی کوڕەکەم کچەکەتی خواستبێت، بەخوا من نابمە دەمڕاست و وەکیلی، بێ عەقڵیی وا ناکەم.

من ئاغام و، ئەم ئیسماعیلەیش وەك كوڕی خۆم وایە، هەرچی داروندارمە بەدەستییەوەیەتی. ئێستایش لەدەرگامان داون و، كچەكەیشت ڕازییە، كەواتە با ناوی خوای لێ بێنین و ئەم ئیشە خێرە ببڕێنینەوە.

بەكر خۆی كردبوو بە كەڕەی شەربەت.. دیاربوو چاوی بڕیبوە ئەوەی كچەكەی ببێتە ژنی ئاغای داهاتوو، هیچ بەتەما نەبوو بە ڕەشوڕووتێكی وەك من ڕازی بێت.

موسا ئاغا وتی:

– بەكر ئەفەندی، ئێستە وتت چی؟

بەكر وتی:

– ئاغا گیان، خۆ من لاریم لێ نییە و، قسەیشتان لەسەر سەرم، بەڵام من چی بە جەبار ئاغا بڵێمەوە؟ ئەگەر سبەی بەردەرگام لێ بگرێت، چی بكەم؟

موسا ئاغا مۆڕەیەكی لە بەكر كرد و، وتی:

– سەیر كە، لێرە یەك ئاغا هەیە، ئەویش منم. موسا ئاغا لە هەر كوێ بێت، هەر قسەی ئەو دەخوات و، ئەوانی تر دەبێ سیر بخۆن و زوڕنا لێبەن، تێگەشتی؟

ئەگەر لەدوای ماڵی دونیا بیت، ئەوا هیچ خەمت نەبێ و، نانت دەكەوێتە ڕۆنەوە.

من بەس بۆ بەیەك گەیاندنی ئەو دوو دڵە لە دەرگام داویت، ئەگەر بێتو بە دەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە...

موسا ئاغا ئەمەی وت و، بێدەنگ بوو، بەڵام ئەم بێدەنگییە هەموو شتێکی ڕوونکردەوە....

بەکر وتی:

– جا کێ دەتوانێ قسە لە قسەتدا بکات، ئاغام؟ دەی ئینشائەڵڵا لەسەر خێر.

لەوکاتەدا خەریك بوو لە خۆشیدا دەفڕیم.. ئەمە خەوە؟ خەیاڵە؟ ڕاستیە؟!

کەواتە ڕۆژگاری تەنیایی و، دووریی و، جودایی و، چاوەڕوانی کۆتایی پێ دێت؟!

**مارەکراین:**

منێکی ساویلکە، دەمویست ئەم عەشقەم بە هەموو دونیا بناسێنم.

لە خۆشیدا جێگەم بە خۆم نەدەگرت، بێ ئاگا بووم لە تاڵییەکانی دونیا.. چۆن بزانم لە خۆشترین کاتی ژیانمدا بەڵایەك ڕوودەدا؟

موسا ئاغا وتی:

– یا ئەڵڵا، مەلایەك بانگ کەن، با ئەم گەنجانە لەسەر خێر لە یەك مارە کات.

لەدوای چارەکێك مامۆستا هاتە ژوورەوە و، بە شایەتی دوو کەس لە یەکتریان مارە کردین، بەلام بێ ئەوەی چاوم بەچاوی زەلال بکەوێت و، ئەم خۆشییە لە چاوەکانی ئەویشدا ببینم.

موسا ئاغا وتی:

– بوکەکەمان بانگ کەن، با دەستمان ماچ کات.

هەستم کرد ئاغا بۆ ئەوە بانگی کرد، تا من بە دیداری شاد بم.

لە دڵی خۆمدا هەر دەموت و دەموتەوە: "ئاغا، چۆن ئەم چاکەیەت بدەمەوە؟".

زەلالی شۆخ و شەنگ و ڕووگەش، بە شەرمەوە هاتە ژوورەوە، بەلام بێگومان سەری بەرز نەکردەوە، ئاخر بەدیار چاوی ئەو هەموو پیاوەوە چۆن لێم بڕوانێت؟

لەکاتێکدا دیلان خان گوێی لە باسی وردەکارییەکانی عەشقی دایك و باوکی دەبوو، غەریب دەهاتە بەر چاوی، واتە دایك و باوکم باشترین نموونەن بۆئەوەی کە عەشق بەربەست و مەحاڵ نازانێت.

کاك ئیسماعیل بەردەوام بوو:

– زەلال چای بۆ گێڕاین، هەر کەسێك پیاڵە چایەکی لەسەر سینییەکە هەڵدەگرت، هەستی بە دەست لەرزینی دەکرد. منیش لە خۆشیدا خەریك بوو دەفڕیم، بەتایبەتی ئەوکاتەی پیاڵەچاکەم هەڵگرت، زۆری نەمابوو وەك منداڵێك بیڕژم.

موسا ئاغا پارچەیەك ئاڵتونی دەرهێنا و دای لە یەخەی زەلال و، پێی وت:

– لە ئێستاوە تۆ بووکی منیت. منیش وەك باوك دەبم بۆت.

پاشان ڕووی کردە بەکر و، وتی:

– دەڵێم، ئێمە سەفەرمان لەپێشە و، جوان نییە ئەم دوانە بێ قسەکردن ئاوا لە یەك جیابنەوە، با چەند دەقەیەك لە ژوورێکدا بۆ خۆیان دوو قسە بکەن، ئینجا دەڕۆین.

ئاغا گیان! تۆ چەند مرۆڤێکی دڵپاکیت، تۆ چ مرۆڤێکیت کە لە هەموو شتێك تێدەگەیت ...

من و زەلال:

چەند ساڵێك بوو زەلال چوو بووە دڵمەوە، هەر بە یەکەم بینین بەشێکی گەورەی دڵمی داگیر کردبوو.

باوەڕم نەدەکرد ئیتر زەلال بووەتە ژنی من..

منیان بردە ژوورێکی بچووکەوە.. بینینی ژنەکەم، وەکو ئەوە وابوو کە چاوێکم بیەوێت ئەوی تریان ببینێت.

زەلال هاتە ژوورەوە..

هەستم دەکرد شۆخ و شەنگترین دروستکراوی خوایە! چۆن دەکرێت مرۆڤێك هێندە سەراسیمەکار بێت؟

بە دەنگە ناسك و بە ئابڕووەکەی وتی:

- بەخێر بێیت، پیاوەکەم.

زمانم بەسترا و، نەمزانی چی بڵێم، تەنانەت ئەوەی کە دەبوو بیڵێم لەبیرم چووبووەوە. هەر توانیم بڵێم:

- سوپاس.

هێشتاش وەکو دوو گەنجی بێگانە بەیەك و، بە ئەدەبەوە دوور لە یەك وەستابووین. ئاخر هەر ئەم هەڵسوکەوتە جوانانەی ئەو بوو وای لێکردبووم زۆرم خۆش بوێت.

هەرچەندە مانەوە لەگەڵ زەلالدا وەك خەونێك بوو بۆم، بەڵام لەوە زیاتر یەکتربینینەکەمان گونجاو نەبوو. لەکۆتاییدا ویستم ئاگاداری بکەمەوە لەوەی کە ڕێمان سەختە و، وتم:

- هەموو شتێك کۆتایی نەهاتووە، لەبەرئەوە زۆر وریای خۆت بە.

- دەزانم. هەتا ئەو ڕۆژەی ماوم، ئەم ئابڕووەم وەك چاوم دەپارێزم. ئیتر من ژنی تۆم و، تۆیش تەنها پیاو و مەحرەمم دەبی. مەگەر مردن من لە تۆ بسێنێت.. گیانی خۆیشم بە خوای گەورە سپاردووە، ئەو زاتەیش ویستی لەسەر هەر شتێك نەبێت، نایەتە دی.

نەمدەزانی لەبەردەم ئەم دڵسۆزیی و وەفادارییەیدا چی بڵێم!

تەنها توانیم بڵێم:

- خوای گەورە تۆی وەك ڕەحمەتێك کردووەتە نسیبم.

دیلان خان بە هەنسك هەڵکێشانەوە وتی: "دایە گیان، خوای

گەورە تۆی وەك دیارییەكی بەنرخ پێ ڕەوا بینیوم... من شانازی بە یادگارییەكانتەوە دەكەم، دەبێ وا بكەم تۆش شانازی بە كچەكەتەوە بكەیت.. ئاخ! دایە گیان، ئاخ!" .

دیلان خان تا دەهات زیاتر بە چیرۆكی دایك و باوكی سەرسام دەبوو و، وەكو كەسێك كە تەماشای فیلمێك بكات و، مەراقی كۆتاییەكەی بكات، گوێی بۆ باوكی ڕادێرا بوو.

كاك ئیسماعیلیش بەردەوام بوو:

– لە ڕێگا لە دنیای خواست و خۆزگەكاندا مەلەم دەكرد، بێ خەبەر لەوەی داهاتوو چی بۆ حەشار داوین.. تومەز جەبار ئاغا بە وردی چاودێری گەورە و بچووكی ژیانی كردبووم.

كاتێك موسا ئاغاش زەلالی لە من مارەكرد بوو، بەكر بێ سێ دوو هەواڵی بۆ جەبار ئاغا ناردبوو و، وتبووی:

– بە زۆر كچەكەیان لێ سەندم، بەڵام ئەگەر ئێستەش بتەوێت، من لاریم لێ نییە.

واتا بەكر ویستویەتی ژنێك، كە لە من مارە كرابوو، بیدات بە جەبار ئاغا.

لەو كاتەدا دیلان خان لەبەر خۆیەوە وتی:

– ئەمە چۆن باوكێكە؟

– ئاخر.. ئەمە چۆن باوكێكە؟

کاک ئیسماعیل هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و، وتی:

بەڵام دواتر زانیم، ئەم ماستە بێ موو نەبووە و، نهێنییەك لە ئارادا بووە، کە تەنانەت زەلالیش ئاگاداری نەبووە.

دیلان خان بە پەرۆشەوە وتی:

– یەعنی چی؟

– بەکر باوکی ڕاستەقینەی زەلال نەبوو و، زڕباوکی بوو.

دیلان خانم بەسەرسامییەوە وتی:

– بەڕاست!

– کاتێك باوکی زەلال وەفاتی کردووە، دایکی لەگەڵ بەکردا هاوسەرگیری کردووەتەوە. زەلالی بەستەزمان زۆر بە دەست زڕ باوکییەوە ئازاری چەشتووە.

کاک ئیسماعیل سەیرێکی کچەکەی کرد و، وتی:

– سەرەڕای ئەوەش، جەبار ئاغا لە بەرانبەر زەلالدا، ئەسپێك و، پێنج سەر مەڕی دابوویە و، قەولی شتی تریشی پێ دابوو.

ئێمەی ساویلکەیش نەماندەزانی ئەو ئەسپ و مەڕانە چییان لێ هاتووە و، گومانمان لە شوانێکی داماو کرد بوو، هەر بۆیە موسا ئاغا شوانەکەی لە کێڵگەکە دەرکرد.

دیلان خانم بە تاسەوە وتی:

– ئێ، دوای ئەوە؟ ئەو جەبارە بەدکارە چی کرد؟

کاک ئیسماعیلی ستەمدیدە برینەکانی کولابوونەوە و، هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت، بەلاّم دیلان خان بەرگەی ئەمەی نەگرت و، باوەشی کرد بە باوکیدا و، وتی:

– باوکە گیان، وا لە خۆت مەکە، من بەرگە ناگرم ئاوا بتبینم.

– جەبار ئاغا، ماخۆلانی پێ کەوتبوو، دەیویست تەنیا بکەوم و فرسەتم لێ بێنێت، ناچار منیش لەگەڵ جوتیارەکانی کێڵگەکاندا ئیشم بۆ خۆم دەدۆزیەوە.

کاتێك زانی بێ هۆ خۆی ماندوو دەکا و تیر بە تاریکییەوە دەنێ، پیاوەکەی ناردبوو بە شوێنمدا.. پێشتر موسا ئاغا ئاگاداری کردبوومەوە:

– ئەگەر ئەم قورمساغە هاتە سەر ڕێت، هیچ قسەی لەگەڵ مەکە، ئەو نیازی خێر و ژنهێنان و شتی وا نییە، دەیەوێ ئەو کچە چارەڕەش کا، هەرچی ڕێسا جوابی مەدەرەوە و، بەخۆم بڵێ.

منیش ناچاربووم بچم بۆ لای جەبار ئاغا.

## جانەوەرێکە، کە چاوی بە کەس بەرایی نایەت ....

جەبار ئاغا، هەرچی بە زارا هات وتی، چاوەکانی خەریك بوو دەردەتۆقین.

لە داخا قامچییەکەی دەستی بە داروبەردی ئەو ناوەدا دەکێشا.

منیش چاك دەمزانی کە چ بەلاّیەکی بەناوچاوانەوەیە، بەلاّم لەبەر

زەلال ئەمانە بۆ من ئیتر وەکو گیزەی مێش بوون، چونکە ئەو تەنها ئەو گوڵە نەبوو کە لە دڵمدا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر دەگەشایەوە، بەڵکو ئەو ئیتر هاوسەر و، هاودەمم بوو و، بووبووە پارچەیەك لە جەرگم.

جەبار ئاغا هەر ئەوەندە لە دوورەوە چاوی پێم کەوت، ئەوەی دەیوت نەیدەوتەوە:

– هەتیوی سپڵە، دیارە هێشتا ئاقڵ نەبووی، باشە من من پێم نەوتی هەرچیت کرد لەپێشا پرس بەخۆم کە؟

من سەرم داخست و نقەم نەکرد، ئەو بەردەوام بوو:

– بە هەموو عەقڵی خۆتەوە، پیرەپیاوی باوکمت پێش خۆت داوە و، چوویت ئەو کچەت مارەکردووە کە من بەتەمای بووم؟ دەزانی ئەمە یەعنی چی؟

پاشان قامچییەکەی نایە سەر سنگم، بەڵام من هەر هیچم نەوت.

– هەتیو، یەعنی زیاد لەبەڕەکەی خۆت پێت ڕاکێشاوە.

یانی ژنەکەمت لێ زەوت کردووم.. بەرانبەر کێش ئەمە دەکەیت؟ جەبار ئاغا، ئاخر شوانێکی ڕەش و ڕووتی وەك تۆ چۆن وێراویەتی ئەمە بکا؟ دەبێ تەمێت کەم.

بە هەموو هێزی دارێکی کێشا بە سەرمدا و، سەرم گێژی خوارد، بەرچاوم لێڵ بوو و، بوورامەوە.. بەڵام ئەو هەر دەستی هەڵنەگرت و بە کوتەك کەوتە گیانم...

سەیری ئەم ستەمەی لە منی بەستەزمانی دەکرد، چونکە ڕێك وەك ئەوە بوو لە مردوویەك بدەیت ...

دیلان خان بە فرمێسکڕشتنەوە وتی:

– ئاه، باوکە گیان، یەعنی ئەو خەتەی لە سەرتدا جێگەکەی دیارە ئیشی ئەو دڕندەیەیە؟

کاك ئیسماعیل بە دەسرینڕشتنەوە چاوی لە چاوی کچەکەی بڕی و، تەنها توانی سەری وەك ئاماژە بۆ (بەڵێ) بابدات.

– کە تۆزێ هۆشم بەبەردا هاتەوە، لە ئەمبارێکدا موسا ئاغا لەژوور سەرم بوو و، جلە خوێناوییەکانی بۆ دەگۆڕیم، لەگەڵ یەکێکیشدا قسەی دەکرد:

– وەزعی زۆر خراپە، خێراکەن پزیشکێك بگەیەننە ئێرە... ئاوا بیبەین بۆ نەخۆشخانە تووشی هەزار سەرئێشە دەبین.

سەیری ئیشی خوای گەورە، کاتێك ئەم دڕندەیە ئاوا شلوکوتی دەکردم، زەلال دڵی دادەخورپێت و، بە دایکی دەڵێت، دایکیشی پێی دەڵێت:

– لەوانەیە بەڵایەك بەسەر ئیسماعیلدا هاتبێ، چونکە دڵی دۆست و نزیك لە خۆشی و ناخۆشیدا هەست بە یەکتر دەکەن، با دووریش بن.

کاتێـك پزیشــکەکە گەیشــتبوو و لاشــەی زامــدارمی بــینی بــوو، وتبووی:

– ئەمە چیە کاکە؟ دەڵێی گورگ گازی لێ گرتووە. هەموو گیـانی زام و برینە.

ئەمە لە ئاسەواری شەڕ و ئەشکەنجەش ناچێت، ئەم پیاوە دەڵێـی جانەوەر پەلاماری یاوە.

– موسا ئاغا، دەبێ ئەوە بدۆزیتەوە کە ئاوای بەسەر هێناوە. مـن تەنها پزیشك نیم، بەڵکو فەرمانبەری دەوڵەتیشم، واتا دەوڵـەت ژیـانی هاولاتییەکانی بە ئەمانەت بە من سپاردووە.

ئەگەر ئەم دڕندەیـە، یـا ئـەم سـتەمکارە نەدۆزیتـەوە و تەسـلیمی دەوڵـەتی نەکـەیت و، بـە سـزای خـۆی نـەگات، قوربـانی زیـاتر دێتـە کایەوە.

کاری من تـەنها چارەسـەر نییـە، لەهـەمان کاتـدا ئاگارکردنـەوەی دەوڵەتە لەم ناحەقیەی بەرانبەر نەخۆشەکەم کراوە..

موسا ئاغا ترسی لێ نیشت.. ئەگـەر بزانرایـە کـێ ئەمـەی کـردووە هەم خۆی و هەم کوڕەکەی چارەڕەش دەبوون، بۆیە وتی:

– سەری خۆتان بەم شتانەوە مەیەشـێنن، خـەمت نـەبێ، ئـەوەی ئەمەی کردووە بە سزای خۆی دەگات.

پزیشکەکە وتی:

– موسا ئاغا، ئەم برینانە لێرە چارەسەر ناکرێن، پێویستە بە زووترین کات بگەیەنرێتە نەخۆشخانە، ئەگەر نا، لەوانەیە بمرێت، ڕەنگە زەبر بە دەماخی گەیشتبێت، بۆیە پێویستی بە چاودێریی وردە.

دیارە ئەو پزیشکە زۆر بەزەیی پێمدا هاتووەتەوە، بۆیە ئاوا بەڕووی ئاغادا قسەی کردووە، ئەگینا لەو دەموزەمانەدا ئاغا شانوشەوکەت و سەنگێکی وای هەبوو، کەس بۆی نەبوو لە ئاستیدا بڵێ لەل! تەنانەت شکاتیشی لێ بکرایە، کەس نەیدەتوانی لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێ.

هەرچۆنێك بێ منیان گەیاندبووە کۆنە نەخۆشخانەیەکی قەزایەکی ئەو دەوروبەرە..

لەوێ تەنها پزیشکێك و، دوو پەرستیاری تێدا بوو و، بینای نەخۆشخانەکەیش زۆر پەڕپووت و بێ خزمەت و دوورە دەست بوو.

منیان بردە ئەو ژوورەی چوار قەرەوێڵەی تێدابوو و، نەخۆشەکانی تریان دابەش کردبوو بەسەر ژوورەکانی تردا، دیارە ڕێکەوتوون کەس بەم حاڵەم نەزانێت.

دوو پیاویان کردە پاسەوانی ژوورەکەم و، وتیان:

– ئەمانە خزمەتی تۆ دەکەن، چیت ویست بەوان بڵێ.

ئەو پیاوە ڕووگرژانەیش تەنها بۆئەوەی لە قسەی ئاغا دەرنەچن

ئەم کارەیان دەکرد.

من بەدەست ناڵە و ئێش و ئازارەوە بەهیچ شێوەیەك پشووم نەبوو، لەبەرئەوەی چارەسەرێکی باشیشم بۆ نەدەکرا، ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبووم.

تەنها بە خەیاڵی زەلالەوە مابووم، ئەگەر ئەو خەیاڵانەیشم نەبوونایە، ئەوا زۆر لە مێژ بوو مردبووم.

بەدەم ئێش و ئازارەوە ...

دەمەوئێوارەیەك گوێم لێ بوو پاسەوانەکانی بەردەرگا دەیانوت:

– نابێ پووریێ، کەس ناتوانێت بچێتە ژوورەوە.

لەو دەنگەدەنگەوە تێگەیشتم زەلال هاتووە، بۆیە بە هەموو هێزم هاوارم کرد:

– وازیان لێ بێنن، با بێنە ژوورەوە.

هەر کە زەلال و دایکی هاتنە ژوورەوە، هەستم کرد خۆر لەسەر ژیانی تارم هەڵهاتووە.

کە دۆخی منی بینی وتی:

– بەقوربانت بم.

لەو کاتەدا ئەو قسەیەی بوو بە دەرمانی هەموو برینەکانم.

پاشان بۆ یەکەمجار دەستی گرتم و، بەمەش تەزوویەك بە لەشمدا هات ... دەستیکرد بە دوعا کردن لەو کەسەی ئاوای لێ کردووم.

منیش وام هەست دەکرد خەون دەبینم و، لەخەونمدا بە زەلال شادبوومەتەوە.

دایکی وتی:

– دوو شەوە خەوت پێوە دەبینیێ و، زۆر خەمی بوو. هەر کە هەواڵیشمان پێ گەیشت، ئۆقرەی لێ برِا. شوکر بۆ خودا باوکی لە ماڵ نەبوو، بۆیە خۆمان گەیاندە لات، بەخوا ئەگەر بزانێت شاربەدەرمان دەکا.

منیش بە دەستی لەرزۆکم دەستەکانی زەلالم گرت و، چاوم لە چاوی برِی و، وتم:

– بۆچی تا ئێرە لەبەر من هاتوویت و، خۆت خستۆتە مەترسییەوە؟

بەدەم فرمێسک رِشتنەوە وتی:

– لەبەر تۆ نەك مەترسی، بگرە ئامادەی مردنیشم.

موسا ئاغا لەگەڵ چەند پیاوێکیدا خۆی کرد بە ژووردا و وەکو باوکێك بە میهرەبانییەوە هەواڵی پرسیم و، وتی:

– شوکر کورِەکەم قسە دەکا، کچەکەیشم هاتووە بۆ سەردانی و، خەسووشی لێرەیە!

دیاربوو کە موسا ئاغا دەیویست ئاو بە ئاگردا بکات و، توورِەیی زەلال برِەوێنێتەوە، بەڵام زەلال زۆر بە ساردی مامەڵەی لەگەڵ کرد.

کاتێك موسا ئاغاش هەستی بەمە کرد، وتی:

– کچم زەلال، دەزانم بۆچی تووڕەیت، بەخوا ڕۆڵە من نەمەویست کار بگاتە ئێرە..

قسەکانی تەواو نەکرد و سەری داخست و بێدەنگ بوو، زەلالیش هیچی نەوت، چونکە ئەوە دەبووە بێ ئەدەبی بەرانبەر شانوشکۆی ئاغا.

ئا لەم قسانەدا بووین، بەکر بە هەناسەبڕکێ خۆی کرد بە ژووردا و، وتی:

– ئەوە کوان؟

دیارە گەڕاوەتەوە ماڵەوە و، زانیویەتی کچەکەی و ژنەکەی هاتوونەتە سەردانی من..

بەڕاستی هاتنەکەی موسا ئاغا ڕەحمەتێکی خوای گەورە بوو بۆ پاراستنی ئەم بەندە ستەمدیدەیە و ئەو دایك و کچە بەستەزمانە، ئەگەر نا ئەو بەکرە نارەسەنە ڕۆژی تەواو دەکردین.

– ئـ.. ئە، ئاغام! نەمزانی ئێوەش لێرەن.

بەجۆرێك سەیری من و زەلالی کرد، تێی گەیاندین کە "خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم".

موسا ئاغای دنیادیدە وتی:

– بەکر، بەس نەبوو هاتیت، ئەگەر نا خۆم دەمنارد بە شوێنتا.

سەیرکە ئەم دووانە حەلاڵی یەکترن و، ژن و مێردن.. منیش چاك دەزانم پلانێك لەئارادایە و بە نیازن لە یەکیان جیا کەنەوە، ئەگەر دوور و نزیك ببیستمەوە دەستی تۆیشی تیایە، کۆتاییەکەی زۆر خراپ بەسەرتا دەشکێنمەوە.

ئیتر ئەمە بووەتە مەسەلەی ناووناوبانگ و شەرەفی منیش و، پاراستنی ئەم منداڵانە ئەرکی منە، جا تۆیش زیاد لەبەرەکەی خۆت پێ ڕانەکێشی و، قورەکە خەست مەکەرەوە.

لە کچەکەت و ژنەکەیشت تووڕە نەبیت لەبەرئەوەی هاتوون بۆ ئێرە، خۆم فەرمانم داوە هەواڵیان پێ بدەن بێن ئیسماعیل ببینن.

کەمێ ڕووی زەلال گەشایەوە، لەوانەیە لە دڵیدا سوپاسی موسا ئاغای کردبێت و، خۆی بە منەتباری زانیبێت.

موسا ئاغا وتی:

– دەی یا ئەڵڵا، با پزیشکەکان بە چارەسەری ئیسماعیل ڕابگەن، ئێوەش بگەڕێنەوە سەر کاروبار و ژیانتان.

بەکر بە ناچاری وتی: "یا ئەڵڵا".

زەلالیش بە نیگایەکی میهرەبانانە ماڵئاوایی لێ کردم، ئەمە بۆ من لەبەرانبەر چەندین کاتژمێر قسەکردندا بوو.

لەو کاتەدا کە خەریك بوو بەکر لە ژوورەکە دەچووە دەرەوە، موسا ئاغا وتی:

– ئەگەر ببیستمەوە ناڕەسەنیت کردبێ، لێت خۆش نابم، ها.

بەکر سەری لەقاند و، وتی:

– بەسەر سەر ئاغام.

دیلان خان بەردەوام لە گەرمەی گێڕانەوەکەی باوکیدا (دایەگیان، دایەگیان)ی بوو، هەر کە باوکی ناوی دایکی دەهێنا، برینەکانی دەکولانەوە، تەنانەت وای لێهاتبوو دەیویست فریشتەی گیان کێشان بێت و، ڕۆحی بکێشێت تا بە دیداری دایکی شادبێتەوە.

لە باوکی پرسی:

– ئەی ئاهەنگتان نەگێڕا؟

کاك ئیسماعیل ئاهێکی هەڵکێشا و، بۆئەوەی کەمێك کچەکەی هێور بکاتەوە وتی:

– ئاهەنگ؟ یەڵا، ئێستا چاکە کولاوە، بیهێنە، با دوو پیاڵە چا بنۆشین، منیش ئیسراحەتێك بکەم، دوایی باسەکەیش تەواو دەکەین.

## با دەستمان بە خوێنی خەڵکی بێ تاوان سوور نەبێت،

دیلان خان سەرقاڵبوو بە چا تێکردنەوە، باوکیشی دەزنوێژەکەی تازە کردەوە، بۆئەوەی کەمێك باری ڕۆحی هێور بکاتەوە و، پشوویەك بدات.

ئاگری ڕابردوو بەجۆرێك لە دڵیدا کڵپەی سەندبوو، کە هەرچی دەکرد خامۆش نەدەبوو!

باوك و كچ بەدەم چا خواردنەوەوە، درێژەیان بە باسەکە دا:

موسا ئاغا وتی:

– ڕۆڵە، کە لات چۆڵ بوو، دەمەوێت دەمەتەقێیەك بکەین.

منیش سەرم داخست و، وتم: "بەسەر چاو".

موسا ئاغا بە تەریقییەوە وتی:

– ئەو جەبارە چەقاوەسووە دیسان کەتنێکی تری بۆ ناومەتەوە و، ئەمجارە زیاد لە ڕادە پێی لێ ڕاکێشاوە و، ئەم بەڵایەی بەسەر هێناویت.

هەرچەندە خۆم بەڕیشی سپییەوە ئەو کچەم بۆ خواستوویت، کەچی ئەو ئاوای بەسەر هێناویت، تابڵێیت شەرمەزارم، ئاخر چونکە من قسەم تێداکردووە زۆر لەسەرم کەوت، بەڵام خۆ ئەم هەتیوە گەورە و بچووکی لا نییە، هەر خەریکی ناڕەسەنییە و، حەیای خۆیشی و منیشی بردووە.

چیبکەین ئیتر کوڕمە ... خۆ ناتوانم حاشای لێ بکەم، بەڵام بەخوا تا سەری منیش نەخوات دانانیشێ.

ئاغایەکی دنیادیدەی ڕیش سپیی بەو هەموو شانوشکۆیەوە سەری داخست.. دواتر چاوی لە چاوم بڕی و، وتی:

– ڕۆڵە، زۆرم پێ ناخۆشە ئەم تکایەت تیا دەکەم، بەڵام بۆئەوەی بەڵاکە لەوە گەورەتر نەبێت و، بە ناهەق خوێنی خەڵکی بێ تاوانی تر

نەڕێژرێت، چارەیەکی تر شك نابەم.

منیش نەمکردە نامەردی و، ڕێم نەدا چیتر سەری کزکات، وتم:

– ئاغام، هەرچی دەڵێیت بەسەر سەر و بەسەر چاو.

ئەو بەردەوام بوو:

– ڕەنگە ئەمڕۆ پۆلیس بێت و ئیفادەت لێ وەربگرێت. ناڵێم درۆ بکە، بەڵام ئەگەر مەسەلەکەیان وەك خۆی بۆ بگێڕیتەوە، نەك هەر جەبار، شەرەفی من و بنەماڵەکەیشم لەکەدار دەبێ و، دەبینە بنێشتە خۆشەی سەر زاری مەرد و نامەرد ، پێمان دەڵێن: "نەیتوانی فەلاحەکەیشی بپارێزێ، تەنانەت جڵەوی کوڕەکەیشی پێ ناکرێ"، لای خۆی چەند ساڵە نەمهێشتووە هیچ کەس لەسایەما لارەمل بێت و، ڕێگام بە هیچ ناحەقییەك نەداوە.

ئیتر خۆم تێگەیشتم و، نەمویست لەوە زیاتر بێتاقت بێت، وتم:

– ئاغا، ئێوە خەمتان نەبێ، خۆم دەزانم چی دەڵێم.

ئاغا هەستایەوە و بە حەسرەت و ئاهکێشانەوە وتی:

– خوای گەورە کەس بە منداڵەکەی تاقی نەکاتەوە! پاسەوانەکان چاوێریت دەکەن، خەمی زەلالیشت نەبێت.

بەبیستنی ناوی زەلال، هەستم کرد چەندین تەن تاشەبەرد بەسەرمدا بارین.

داوه شەیتانییەکە:

پاش ئەو دوو ڕۆژە پڕ دەردی سەرییە و، کاتێک وامدەزانی ئیتر ئامێك هەڵدەکێشم و ڕزگارم دەبێ، چەرمەسەرییەکی ترم هاتە ڕێ.

بەو جەستە دەردەدار و شەلوکوتەمەوە بەرەو کێشەی دواتر دەچووم! ئەو ماوەیە وەك کشوماتی دەریابوو پێش گەردەلوول.

پزیشك ئەو بەیانیە چەند پشکنینێکی بۆ کردم، بەڵام هیچی نەوت و، لە ژوورەکەم چووە دەرەوە. دیاربوو تەندروستیم هیچ باش نەبوو.

ئەو زوو زوو ئەم قسانەی دەدایەوە بەگوێمدا: "پێویستت بە چاودێری و چارەسەرێکی جددی هەیە، لێرە ئامێر و کەرەستە و دەرمانی پێویستمان نییە!"، بەڵام کەس گوێی بەمە نەدەدا و، خۆیشم لەڕووم هەڵ نەدەهات ئەمە بە ئاغا بڵێم، کاتێکیش هەواڵی دەپرسیم، بە "شکور باشم"، خۆم لە پرسیارەکەی دەدزیەوە.

خۆ لەو ژوورەدا بشمردمایە پاسەوانەکان هیچ هەواڵێکیان بە ئاغا نەدەدا. لەوانەشە ئەوانیش پیاوی جەبار ئاغا بووبن، چونکە بە چاك و خراپ چارەی منیان نەدەویست.

بۆ نا؟ خۆ ئەو جەبار ئاغایە هەموو ژیانی، پارە و ڕابواردن و کاری نابەجێ بوو.

بۆئەوەی زەلالم لێ داگیر بکات، خۆی لێ کردبووم بە ئاغا و، کۆمەڵێك جروجانەوەری کردبووە دەست و پێوەندی، کە هەموویان

کەسانی ناپاك و، بەدكار و، پیاوكوژ و بێ ویژدان بوون.

ئەو ڕۆژە ئەوەندە بێ تاقەت و بێ حەواس بووم، كە تا ئەو تەمەنە شتی وام بەخۆمەوە نەدیبوو.. هەزار خەیاڵی خراپ وەك ئەژدیها بە ددانە تیژەكانیان دڵیان پارچە پارچە دەكردم.

بەخوا ڕاستیان وتووە: "هەستی مرۆڤ هەمیشە ڕاست دەردەچێت"، منیش دڵم داخورپابوو!

لەو كاتەدا دیلان خان دەستی خستە سەر دڵی و، وتی:

– تاساوم باوكە، هەستەكەم بە هەزار حاڵ هەناسە هەڵ دەكێشم.

دیسان بە ئەسرینەكانی گۆناكانی پاراو كردەوە.

كاك ئیسماعیل جار جارە هەناسەیەكی ساردی هەڵ دەكێشا و بەردەوام دەبوو:

– دەمەو نیوەڕۆ بوو. دوو پاسەوانەكە خۆیان كرد بە ژوورا. لە هەڵسوكەوتیانا هەستم بە شتێكی سەیر كرد. ئەو ڕۆژە زۆر جیاواز دەجوڵانەوە!

یەكێكیان وتی:

– كاك ئیسماعیل، لێرە باش تیمارت ناكەن، بۆیە ئاغا فەرمانی كردووە بتبەین بۆ شار.

سەرم لەم مەتەڵە دەرنەدەكرد، دەزانم دەبوو بوو بچمە نەخۆشخانەی شار، بەڵام خۆ ئاغا نەهاتووە، ئەی كێ ئەم فەرمانەی

دەرکردووە؟ ئەم دوو پاسەوانەش ناتوانن بێ ئیزن بمبەن.. یان.. ئەم ماستە بێ موو نییە؟

لەخۆوە چەند خەیاڵێك بە مێشکمدا هاتن، منیش بۆئەوەی لە ئەصڵی مەسەلەکە تێ بگەم وتم:

– پەرستارەکەم بۆ بانگ کەن.

– تا ئێوارە ئیزنی وەرگرتووە و، لێرە نییە.

– ئەی دکتۆر؟

– ئەویش تۆزێ لەمەوپێش ڕۆشت.

– ئەی من چۆن دەگوازنەوە بۆ شار؟

– ئاغا سەیارەیەکی هێناوە، خۆشی نەیتوانی بێتە سەرەوە و، لە خوارەوە چاوەڕێتە.

هەموو شتێك بڕابووەوە، منیش هەر نەدەچوومە ژێر باری ئەم مەسەلەیەوە، بەڵام سەرەنجام ناچار خۆم کۆکردەوە. چۆن بمزانیایە ڕاست دەکەن یا نا؟

هەرچۆنێك بوو بە هەزار حاڵ خۆم گۆڕی، بەڵام نەمدەتوانی بە پێوە بوەستم، بۆیە دوو پاسەوانەکە هاتنە ژێر باڵم و، بێ ئەوەی بڵێن نەخۆشە و ئازاری هەیە، بەخێرایی گەیاندیانمە دەرەوە .

ئەمە بەتەواوی لە ڕفاندن دەچوو، نەك گەیاندنە نەخۆشخانەی شار، بەڵام لەبەر ئێش و ئازاری جەستەم هۆشم بە دنیاوە نەمابوو.

لەبەردەم دەرگای نەخۆشخانە ئۆتۆمبێلێکی شین ڕاگیرابوو و، سایەقەکەیم نەدەناسی، بەگومانەوە وتم:

– کوا ئاغا؟

– تۆ سەرکەوە، ئێستە ئەویش دێ.

ئنجا وەکو فەرشە کۆنێك فڕێیان دامە سەر کوشنی دواوەی سەیارەکە و، کابرای سایەق پێی نا بە بەنزینا. یەکێك لە پاسەوانەکان لە پێشەوە و یەکێکی تریان لە تەنیشت من لە دواوە دانیشتبوو. وەکو دوو پڵنگی چاوبرسی چاویان لەسەر نەدەتروکانم.

منی داماویش وتم:

– باشە کوا ئاغا؟ بۆ کوێم دەبەن؟

کابرای سایەق بە گاڵتەجاڕییەوە وتی:

– کەوایە با مژدەت بەمێ.. دەتبەین بۆ لای زەلال، ئاغاش لەوێیە. ئەمشەو زەماوەندەکەتانە.

لەناکاو گومانێك وەك هەورەتریشقە بە خەیاڵمدا هات ... تۆ بڵێی ئەمە پلانێك بێت؟

تێ گەیشتبووم کە ئەمە ئاخری خێر نابێ، وتم:

– بەم حاڵەوە زەماوەندی چی؟ ڕاستییەکەم پێ بڵێن.

– ئێمە بەس ئەو فەرمانە جێبەجێی دەکەین کە پێمان دراوە.. خەمت نەبێ، کە گەیشتین بەدیداری ئاغا شاد دەبیتەوە.

زۆر لەسەری نەڕۆشتم، خۆ هیچیشم لەدەست نەدەهات و، نەمدەتوانی خۆم لە سەیارەکەوە هەڵ بدەمە خوارەوە.

وەك ئەو مەڕە بووم کە چاوەڕێی قەسابەکەی بێ!

**وەك ئەوەی بڕۆم بۆ جەهەنەم:**

(دیلان)خان خۆی هاویشتە ئامێزی باوکییەوە:

– کەواتە من کچی پیاوێکم، کە بەرەنگاری ئەم هەموو دەردی سەرییە بووەتەوە!

کاك ئیسماعیل –کە دەستی میهرەبانیی بەسەری کچەکەیدا دەهێنا– بەردەوام بوو لە تەواوکردنی بەسەرهاتەکە:

– بۆ بانگی عەسر کە گەیشتینە جێ، ڕێگەیەکی سەخت و بەردەلاَنمان بڕی بوو، برینەکانیشم خوێنیان لێدەڕژا. هەستم دەکرد جەستەم پارچە پارچە بووە! لەڕادەبەدەر ئێش و ئازارم هەبوو.

تا زیاتر لە ماڵی بەکر نزیك بوومایەتەوە، پەرێشانتر دەبووم و، دڵنیاش بووم لەوەی کە بەوپەڕی سووکایەتی پێکردنەوە پێشوازیم لێ دەکرێت، هەروەها بۆ سەلامەتیی (زەلال) هەر دەم بەدوعا بووم.

دوو پاسەوانەکە بێ هیچ بەزەییەك فڕێیان دامە بەردەم ماڵی بەکر.

خودایە، چی ببینم؟

جەبار ئاغا و، بەکر و، دوو پیاوەکەی، کابانە بەستەزمانەکەمیان

لـه سوچـێکدا بەنـد کـردووە و، بەلێـدان و کوتـەك وەشـاندن ڕوویـان شـینومۆر کردبوویـەوە، لێوەکـانی زامـدار بوویـوون... خودایـە، لێـرە بازاڕی گیان فرۆشتن بووە!

کاتێك بینیم ئەو بێ ڕەحم و، دڕندانـە وایـان لـە ژنەکـەم کـردووە، بەچۆکدا هاتم.

سەربەخۆ بڕیاریان دابوو تاقە هاوسەفەر و هاوسەری لێ مـارەبڕاوم لە چنگ دەرکەن ... ئای! ئەمە چ زوڵـم و سـتەم و، دڕنـدەیی و، بـێ ویژدانیی و، نامرۆڤایەتییەك بوو، کە نە لە داب و نـەریتی باووباپیران و، نە لـە ڕەوشـت و، نـە لـە کـەلتووری ڕەسـەنی پێشـیندا شـتێکی وا قێزەون هەیە؟

دیلان خان وتی: "دایکە گیان، خۆزگە من ئەو ئازارانەم بچەشـتایە لە جیاتی تۆ...".

بـاوك و کـچ بـە هەنسـك و فرمێسـك ڕشـتنەوە ئـەم لاپەڕانـەی ڕابردوویان هەڵدەدایەوە و، بە پشکۆی ژینێکی پڕ ناسـۆر ئاهوناڵـەیان دەکێشا.

دیلان خان لەو ساتەوە کە فامی کردووەتەوە، کـەم کـەم زانیـاری لەسەر ڕابردوو بیسـتبوو، بۆیـە ئـەمجارە ئـارەزووی دەکـرد لـە تـان و پۆی ئەم باسە داستانئاسایە ئاگادار بێت.

## درندەیی جەبار ئاغا!

جەبار ئاغا قاچی خستبووە سەر قاچ، دوو پاسەوانەکەیشی لە دوایەوە وەستابوون.

بە خەندەیەکی فێڵبازانەوە وتی:

– سەیر کە هەتیو...

من لەتاو ئازار ئاگام لە خۆم نەبوو و، تەنها لە دڵی خۆم لە خوا دەپاڕامەوە بۆ سەلامەتی هاوسەرەکەم، قەینا بشمکوژن، بەڵام لە پێش چاوی ئەو نا.

– تۆ منداڵە وردکەیت و، منیش ئاغایەکی بە شەهامەت و قودرەت... وانیە؟

بەکر وتی:

– وایە ئاغام، گومان لەوەدا نییە...

– کەوایە چۆن وێراوتە ئەو کچە لە خۆت مارەکەیت، کە من حەزم لێی کردووە؟

بەکر وتی:

– بەڵێ ئاغام، منیش هەر وام پێ وت.

– ئەو پیرەپیاوەت فریو داوە، کە ئێستا نەخۆشییەکەی خراپتر بووە و، دەستلەملانی مردنە، بۆیە ئێستا لەبەرانبەرمدا تەنها خۆت و گوێچکەتن.

بەتەواوی کاس بووبووم، گوێشم لە قسەکانی بووایە نەمدەتوانی وەڵام بدەمەوە، خۆ من لە توانامدا نەبوو پارێزگاری لە خۆم بکەم.

بە جوێنە قێزەونەکانییەوە بەردەوام بوو:

– بەکورتی کەرێتییەك بوو و کردت، ئێستەش پێکەوە کۆتایی پێ دەهێنین.

بەکر وتی:

– هەر وا دەبێت ئاغام، چۆنتان بوێت وا دەکەین.

– کچەکە ئیتر تۆی ناوێت، ئێستاش کە خۆی لێرەیە لێی جیا دەبیتەوە، دوایی دەگەڕێیتەوە بۆ نەخۆشخانە. ئەگەر بشڵێیت: "لێی جیانابمەوە و ئەمانە"، سەری خۆت دەیەشێنیت، چونکە بۆ شوێنێکی ترت دەنێرم...

گوێکانم دەزرنگانەوە. جەستەم هەمووی زامار بوو، دڵم خەریك بوو لە سینەم دەهاتە دەرەوە...

– گوێت لێم بوو؟

خۆ من هەر هێزم تێدا نەبوو وشەیەکیش بڵێم.. بۆیە جانەوەرئاسا مەستایە سەرپێ و بە تووڕەییەوە لەقەیەکی دا لە پشتم.

(زەلال)ی داماو هاواری کرد:

– بەقوربانتان بم، توخوا وای لێ مەکەن.

بەکر بە هەموو هێزی زللەیەکی لێدا.

دەمانچەیان لەسەر سەرم ڕاگرتبوو و، پێی وتم:

– ئەگەر ئەوەی دەیلێم دووبارەی نەکەیتەوە، بە شەرەفم هەر ئا لێرەیا دەتکوژم.

"من زەلال تەڵاق دەدەم و، ئیتر ژنی من نییە".

لە جیاتی ئەم قسەیە مردنم لا خۆشتر بوو، چۆن دەتوانن ئەمە بە من بکەن؟ بۆیە نقەم نەکرد.

– دەی هەتیو بیڵێ ...

جەبار ئاغا –کە لە تووڕەیی و نەفرەتدا چاوەکانی سوور داهاتبوون– فێری ئەوە نەبوو بوو کەس پێی بڵێ "نا".

کاتێك نەیتوانی ناچارم بکات تەڵاقی بدەم، وتی:

– جا ڕێی ئاسانتر هەیە.

پاشان بە زەلالی وت:

– ئەگەر نەڵێیت "من تۆم ناوێت و، شوو بە جەبار ئاغا دەکەم"، ئەم هەتیوە دەتۆپێنم.

بەکریش خۆی کردە بابەتەکەوە و وتی:

– بیڵێ کچەکەم، ئەگەر نا بەخوا دەیکوژێت، هیچ نەبێت بیرێك لە گیانی ئەو کەرەوە.

تۆزێ خۆم کۆکردەوە و، ڕووم کردە زەلال، بەڵام خودایە، ئەوە چ ڕازونیازێك بوو لە چاوەکانیدا دەمخوێندەوە، کە دەیویست بڵێت:

"هەرچیەك بڵێم لە دڵەوە نییە!".

پاش ئەوەی جەبار ئاغا لە زەلالیشەوە هیچی نەبیست، ئەوەندەی تر تووڕە بوو و، دەستی کرد بە هەڕەشەکردن، ئا لەو کاتەدا هەر ئەوەندەم زانی زرمەیەك لە قاچمەوە هات.

زەلال هاواری کرد:

– من بکوژن ... بەقوربانتان بم، من بکوژن، توخوا دەست لەو مەدەن.. چیتان بوێت دەیکەم.

ئەویش دەیزانی کە یەکەم فیشەك تەنها ئاگادارکردنەوەیەك بوو و، گەر پێشنیارە بەدەکەیان پەسەند نەکات، ئەوا فیشەکی دووەم ڕاستەوخۆ بۆ سەرم دەبێت.

زەلال لە خۆی دەدا و، سەری بە دیواردا دەکێشا...

جەبار ئاغا لە پاش ڕەزامەندی زەلال وتی:

– ئێ.. ئاوا بڵێ. ئێستا دووبارەی بکەرەوە، کە واز لەم ئیسماعیلە شوانە دەهێنیت و، شوو بە من دەکەیت.

**هاواری دڵان: "خودایە بە هانامانەوە بێیت!"**

زەلال بەهەموو دەنگی هاواری کرد:

– خوایە گیان! فریامان کەوە.

ئەم هاوارە، ئەوەندە لە قووڵایی دڵییەوە دەرچوو، هەستمان کرد ژوورەکە دەڕووخێنێت و، دەگاتە عەرشی خوا...

لەناکاو پۆلیس خۆی کرد بە ژووردا و، هەمووان بەم دیمەنـە دۆش دامان.

خودایە! ئەمە خەیاڵە؟ یان خەونە؟ یان لە جیهانێکی تردایین؟

واتە خوای گەورە هێندە زوو وەڵامی دوعاکان دەداتەوە؟

- کەس لە جێی خۆی نەجووڵێت.

دوو فیشەکیان نابوو بە قاچمەوە و، خەڵتانی خوێنیـان کردبـووم. جەبار ئاغاش لە سەرسامییدا لەجێی خۆی نەجوولا.

ئا لەو کەینوبەینەدا -کە لـەوە دەچـوو زەمـەن بـۆ چـەند سـاتێك وەستابێت- زەلال خۆی گەیاندە لام.

- بەقوربانت بم ئیسماعیل.

سەرزەنشـتی خـۆی دەکـرد و، لـە خـۆی دەدا، ڕووە شینەوەبووەکەمی بەدەستە میهرەبانەکانی دەسڕی.

لەو کاتەدا دیلان خان وتی:

- بەسە باوکە! بەسـە! دە شـتێکی خـۆش بـاس بکـە، ئـاوا بـەو ئازارچەشتنەی دایکم ڕۆحم دەردەچێت ...

کاك ئیسماعیل بە میهرەبانانە وتی:

- خۆزگە! خۆزگە بمتوانیایە شتێکی خۆشت بۆ باس کـەم، ئـاخر بۆیە چەند ساڵە ئەم ڕابردووەت لێ دەشارمەوە ... وتم "منداڵی دامـاو بەرگـەی ئەمـە ناگرێـت"، ئـەوەتا لـەم تەمەنەشـدا ناتوانیـت بەرگـەی

بگریت، ئێستە تێگەیشتیت بۆچی ئەمانەم لا نەدرکاندوویت؟

ناخ و سینەی کچ و باوك لە ئاست ئەو دڕندەیی و، نامرۆڤ بوونـەدا کڵپەی دەدا... کاك ئیسماعیل بە فرمێسك ڕشتنەوە بەردەوام بوو:

- خـوای گـەورە! سـزادەری سـتەمکاران و، چـاودێر و دالـدەی سـتەمدیدەیان تـەنها تۆیـت... خوایـە گیـان، تـەنها تـۆ شایسـتەی پەرستنیت، مـەرگ و ئەجـەلیش تـەنها لەدەسـت قـودرەت و ئـیرادەی موبارەکتایە، بەڕاستی تەمەنێکی چەند ساڵە بۆ سوپاسگوزار بوون لە ئاست نیعمەتەکانتدا کەمە؟"

پـۆلیس جـەبار ئاغـای وەکـو تاوانبـار دەسـتگیر کـرد، بـەکر و دەستوپێوەندەکەیشـیان خسـتبووە ژێـر چـاودێرییەوە، بێگومـان بـە خێرایـی منیـان گەیانـدە نەخۆشـخانە. زەلال و دایکیشـیان بـۆ لێپرسینەوە برد بۆ بنکەی پۆلیس.

بەڕاستی تەنها خوای گەورە دەرووی لێ کردینەوە، دەنا ئەو ناپاك و دڕەندەیە دەیکوشتم.

دیلان خان وتی:

- ئاخ باوکە! ئەم جەبار ئاغایە چۆن ستەمکارێك بـووە! سـەیری ئەو هەڵوێستەی کە لەبەردەم نەخۆشی باوکیدا، یان چۆن بەرۆکی ئەو کچە بەستەزمانەی بەرنەداوە!

چۆن دەشێت ئەم پیاوە بە خۆی بڵێت مرۆڤ؟ تەنانەت دڕندە و جڕوجانەوەریش نەوە و کەسی خۆی دەپارێزێت. کەچی ئەو ویستی هاوسەرە شەرعیەکەت لێ زەوت بکات.. دیارە دڵۆپێك ویژدان یا سۆز و بەزەیی شك نەبردووە.

- کچە ژیرەکەی باوە، دەبێ تا ئەم تەمەنە تێگەیشتبیت، کە ئەگەر کەسێك ترسی خودا و ڕۆژی دوایی لە دڵدا نەبێت، گاز لە پەنجەی شەیتانیش دەگرێت.

دیلان خان بە هەموو سەرنجییەوە گوێی لە باوکی گرتبوو و، نەیدەویست تەنانەت یەك وشەشی لە دەست بچێت.

- پۆلیسەکان لە بنکە لێپرسینەوەیەکی باشیان لەگەڵدا کردبوون.

- باشە باوکە گیان کێ هەواڵی بە پۆلیسەکان دابوو؟

- پزیشکی نەخۆشخانەی قەزاکە، کاری ڕاست بێ، کە زانیبووی منیان لە نەخۆشخانەوە فڕاندووە، ڕاستەوخۆ هەواڵی بە پۆلیس دابوو.

- دوایی؟

- جەبار ئاغا و بەکر و پیاوەکانیان ڕەوانەی زیندان کران و، زەلال و دایکیشیان بۆ چارەسەر نارده نەخۆشخانە.

ئێمە دوو دڵی بریندار و، دوو جەستەی شەکەت بووین، کە لە سەرەمەرگدا ڕزگارمان بوو و، لە نەخۆشخانە یەکترمان بینییەوە.

زەلال زۆر خەمی خۆی نەبوو و، وەکو پەروانە بەدەورمدا دەهات و دەچوو.

هێندە خوێنم لێ ڕۆیشتبوو، هێزم تێدا نەمابوو، تەنانەت توانای قسەکردنیشم نەمابوو.

زەلال لە نەخۆشخانە وەك پەرستاری تایبەت و باشتریش چاودێری و خزمەتی دەکردم و، دەیوت: "ئەمەش بخۆ، ئەمەش بخۆوە ... سەیرکە، ئەمە بۆ تۆ زۆر باشە".

## مەرگی ئومێدەکان:

کە ئێمە لە نەخۆشخانە بووین بەداخەوە هەواڵی کۆچی دوایی موسا ئاغامان بیست.

با کوڕەکەیشی لە زینداندا بێت، بەڵام ئیتر نەماندەتوانی لەوێ هەڵکەین، سەرۆکی بنکەکە دوای دوو ڕۆژ هات بۆ سەردانم و، لەبەرئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری باسەکە بوو، وتی:

- ڕۆڵە، لە بارێکی زۆر قورس و مەترسیداران، هەرچەندە پاراستنتان ئەرکی سەرشانمە، بەڵام لە هەمان کاتا منیش باوکم و، ماڵ و منداڵم هەیە، لەبەرئەوە خەیاڵ و چاوەڕوانییەکانتان زۆر باش دەزانم.

هەرچی بیرم کردەوە لەوەی چۆن یارمەتیتان بدەم، ڕێگا چارەیەکی گونجاوم نەدۆزیەوە. با ئێوە حەڵاڵی یەك بن، بەڵام خۆ

دەرد و بەڵا دەوری تەنیون.

ڕاستە جەبار ئاغا و بەکریش لە زیندانـدان، بەڵام خۆ لە سەلامەتیتان دڵنیانین و، ڕەنگە لە ناکاو بەڵایەکتان بەسەردا بێنن.

سەرۆکی بنکەکە بەردەوام بوو لە قسەکانی، لە ڕاستیدا ئەویش نەیدەزانی چیمان بۆ بکات. بە بێچارەییەوە قسەی دەکرد، لە کۆتایی قسەکانیدا ڕووی تێ کردین و، وتی:

– من دەڵێم، لەم ناوچەیە بڕۆن، خۆتان ون بکەن، گەر جەبار ئاغا دەستی پێتان بگات، تا ماون خۆشی نابینن لە ژیانتان. منیش لە دڵی خۆمدا دەموت: "ئاخر بۆ کوێ بچین؟"

ئێمە نەمان دەزانی بڵێین چی:

– خۆم حاڵی ئێوەم بۆ ئەفسەری لێپرسراوم باس کردووە، ئەویش زۆر کەسێکی باشە.. یارمەتی چەندین بێچارەی وەك ئێوەی داوە. وتی: "با بێن، چارەیەکیان بۆ دەدۆزینەوە".

منیش وتم:

– ئەوێ زۆر دوورە؟!

– ئێوە بۆ ماوەیەك لەوێ بمێننەوە، خۆ ئەگەر بارەکە هێمن ببێتەوە، دەتوانن بگەڕێنەوە.

ئەمە چارەسەرێکی باش بوو بۆ ئێمەی تۆقێنراو، لە ڕاستیدا هیچ چارەیەکی تریشمان شك نەدەبرد.

– هەفتەیەکی تریش لێرە بمێننەوە و، پلانەکەتان لای کەس نەدرکێنن. منیش ئامادەسازییتان بۆ دەکەم و، ڕەوانەتان دەکەم.

کاکی پۆلیس خودا لێت ڕازی بێت! شوکر بۆ خوا لەم دونیایەدا مرۆڤی ئاواش هەیە. ژیانیش بۆ خۆی شانۆیەکە، دەبینی مرۆڤێك ناموسی کەسێکی بێ تاوان لەکەدار دەکات، مرۆڤێکی تریش ئامێز بۆ دوو کەسی نەناسراوی بەستەزمان دەکاتەوە.

خوای بالادەست! بەس نییە ئاخیرەتت خولقاندووە و، لێپرسینەوە و سزا هەیە، دەنا ئەم مرۆڤە ئاژەڵئاسا و نامەرد و، بێویژدانانە لەکوێ بە سزای خۆیان دەگەیشتن؟

دیلان خان وتی:

– زۆر ڕاستە، باوکە گیان.

– تروسکەی هیوایەك، لە دوورەوە دەرکەوتبوو.... بەڵام بێئاگا بووین لەو بەڵایەی هەموو ڕابردوومان هیچ نەبوو لە ئاستیدا و، مرۆڤ ناچار دەکات ئاوات بە مردن بخوازێت...

بەکورتی، تاقیکردنەوەکەمان هێشتا تەواو نەبووبوو...!

دوای چەند ڕۆژێك، دەمەو نیوەڕۆی ڕۆژێکی گەرمی هاوین بوو، کاك (فەیزوڵا) هات و، وتی:

– جەبار ئاغام سەلامتان لێ دەکات و، زۆر پەشیمانە و، داوای لێبووردنتان لێ دەکات. دەڵێت: "ئیتر ئیسماعیل برامە و، زەلالیش

برازنمــه، ئــەوە بــاوکم کۆچــی دوایــی کــردووە، کێڵگەکــەش کەســی بەسەرەوە نییە، بە ئیسماعیل بڵێن با هەرچی زووە، خۆی بگەیەنێتێ و، لەوێ نیشتەجێ بێت.. لەمەودوا ئــەوێ هــی ئــەوە و، مــافی ئێمــەی پێوە نامێنێ.

من لەبەر ئەو هەڵەیەی لەگەڵ ئــەو کردوومــە ئێســتا لــە زینــدانــدام، لەوانەیە لەپای هەڵەکانی تریشمدا تا کۆتایی تەمەنم ئێرە جێم بێ.

هیچ نەبێت لەبەر خــاتری بــاوکم بگەڕێنــەوە کێڵگەکــە، خــۆ بــاوکم هــەردەم پاڵپشــتیان بــوو. لەســەر ئــەو هەڵەیــەی لــە ئاســتیاندا لــێم وەشاوەتەوە، هەرگیز لە خۆم خۆش نابم و، تازە مەگەر بــە مردوویــی لێرە دەرچم".

مەردی خوابە کاك ئیسماعیل، ئێمەش تۆمان پێ پەســەندە ببیتــە ئاغامان و، زەلال خاتوونیش ئاغــاژن. بــاوەڕ بکــەن، هــەموو کێڵگەکــە چاوەڕێتانە.

هۆش و بیرم ســەرلەنوێ ئاڵۆزایــەوە، خــۆ دڵنیــایش بــووم ناکرێــت باوەڕ بەم قسانە بکرێت.

خەسووشم هەر ئەم قسانەی دەدایەوە بە گوێمدا:

– رۆڵە، دوور مەڕۆن، کە لە یەك مارە کرابن، تازە کــێ دەتوانێــت پێتان بڵێت بەری چاوتان کلی پێوەیە؟

تا ئەو کابرایە لە زیندان دێتە دەرەوە، ئێوە دەبنە خاوەن مــاڵ و

منـدالّی خۆتـان. لەبەرچـاومانا بـن و، خۆیشـمان لێ مەشـارنەوە، بـا غەریبییتان نەکەین...

ئا بەم کەینوبەینە سـەرلەنوێ شـەیتان گڵـی کـرد بـە چـاوماندا و، قسـەکانی ئەفسـەری بنکەکـەی لـەبیر بردینـەوە و، بـە قسـەی ئـەو جوتیارە عەوامە فریوی داین.

لـە کێڵگەکـەدا هۆدەیـەکیان بـۆ ڕازاندبووینـەوە، لەبەرئـەوەی (بەکر)ی خەزوورم لە زینداندا بوو، خەسووشـم هێنایـە لای خۆمـان و، هۆدەیەکیشمان بۆ ئەو لە کێڵگەکەدا پێکەوە نا.

من و زەلالی دڵشکستە بەیـەك شـادبووین و، خێزانێکـی بچـووکمان پێك هێنا و، لاپەڕەیەکی نوێ و پڕ هیوا و ئاواتمان هەڵدایەوە.

بەڵام داخەکـەم، ئـەم ئاسایشـە زۆر درێـژەی نەکێشـا و، هەمیشـە ترس لە دڵ بووم، وەك ئـەوەی لـەدوورەوە گـوێم لـە دەنگـی نالّەیـەك بێت، بەڵام هەرگیز نەمدەهێشت زەلال هەستی پێ بکات.

هەسـتم دەکـرد هـەورە ڕەشـەکان ئاسمانـە سـامالّەکەمان تاریـك دەکەنەوە.

# بەشی دووەم



## تاوانێك، كە كانیاوی هەستەكان وشك پێ دەكات

## (زەلال)یش بووە قوربانیی ڕێی هەستە بێ گەردەكانی

**وەك پەروانە دەوری تروسكەیەكی هیوامان دابوو:**

زەلال وەك فریشتەیەك چاودێری دەكردم، ئێواران تا دەگەڕامەوە مـاڵ چـاو لـەڕێم بـوو و، وەك ئـەوەی دوای چـەند سـاڵێك یەكـەمجار بمبینێـت بەخێرهاتنـەوەی دەكـردم، هەمیشـە وەك تـاجی سـەری مامەڵەی لەگەڵ دەكردم.

گەر دوو دڵ یەكتریان خۆش ویست و، بە یەككەیشتن ئـەوا هـیچ غـەمێك دونیایـان لێ تەسـك ناكاتـەوە و، وەك پەروانـە لـە خۆشـیدا دەفڕن...

ماڵەكەمان بۆنی بەهەشتی لێ دەهات... بۆ ماوەی یەك خولـەكیش لە یەكتر دوور بووینایە، بیری یەكتریمان دەكرد، بـەڵام مـن بـەردەوام بەزمەكانی جـەبار ئاغـام لەخـەیاڵ بـوو و، هەسـتم دەكـرد ڕێمـان پـێ

دەگرێتـــەوە و، ئـــەو ژیانـــەمان لـــێ دەكـــات بـــە دەردی ســـەری و، دەربەدەرمان دەكات، ئەم ترسەیشم بێ بنەما نەبوو.

ئـــای! لـــەو ڕۆژانـــە، خۆزگـــە نەهاتنایـــە، خۆزگـــە بـــە قســـەی ئەفسەرەكەی بنكەی پۆلیسمان بكردایە...

جەبار ئاغای نارەسەن، چیت پـێ كـردین! ئێسـتاش دڵم بـۆ ئـەو ڕۆژانە كسپەی لێوە دێت.

دیلان خان كە گوێی لەو حەسرەتكێشانەی باوكی بوو، وتی:

– باوكە گیان، دیسانەوە ئەو كابرایە؟

– بەداخەوە كچەكەم..

تارمایی ماتەم و بێتاقەتی ڕووخساری كاك ئیسماعیلی داپۆشی...

– ئەمجارەیان بەڵایەكی هێندە جـەرگبڕیان بەسـەردا هێنـاین، كـە تەنانەت لە باسكردنیش نایەت.

ئاخ! بۆ ئەو ڕۆژانە ...

لەبەرئەوەی بەكر لە زیندان ئـازاد كـرا بـوو، خەسووشـم گەڕایـەوەماڵەوە.

ئیتر لەگەڵ زەلالدا درێژەمان بە ژیانە سادەكەمان دا، وەك دەڵـێن (تا لێواری مەرگ) یەكترمان خۆش دەویست.

ئای خودایە! تەنانەت ژیانێكمان بە خەیاڵدا نەدەهات بێ یەكتر.

کاك ئیسماعیل ڕووی کردە کچە نازدار و شۆخەکەی و، بەردەوام بوو:

– پاش ساڵێك، فریشتەکەمان لە دایك بوو.

لەو کاتەدا زەردەخەنەیەکی کرد، دواتر وتی:

– لەگەڵ دایکتدا لێت تێر نەدەبووین! ئەو لە باوەشی دەگرتیت و بە حەسرەتەوە بۆنی دەکردیت، منیش کە نەمدەویست بۆ ساتێکیش لێت دوور بم. هەر دایکیشت ناوی (دیلان)ی بۆ هەڵبژاردیت.

بەتەواوەتی (١٣) مانگ بوو ئا بەو شێوە سادە و ئارامە دەژیاین و، تۆیش تەمەنت سێ مانگ بوو و، تا دەهات بە پاکیی و نازداریت زیاتر و زیاتر وابەستەی خۆتت دەکردین..

دیلان خان –کە بەم وشە ناسك و دڵڕفێنانەی باوکی مەست بوو بوو– لەناکاو زەردەخەنەیەکی کرد، ئەمە بۆ یەکەم جارە وا بە وردی گوێی لە تان و پۆی قۆناغی منداڵی خۆی دەبێت.

کاك ئیسماعیل بەردەوام بوو لە قسەکانی:

– ئەو ماوەیە دەنگوباسی ئەوە هەبوو کە جەبار ئاغا بە سزای خۆی گەیشتووە و، زۆر ئازاری چەشتووە، بەڵام هەیهو! ئەمانە بەس قسەوقسەلۆکی خەڵکە کاڵفامەکە بوون و، زۆر لە ڕاستییەوە دوور بوون، تەنانەت ئەمەش بەشێك بوو لە پیلانێکی گڵاو.

ئەو ڕۆژە... کاتێك دەمەو بەیانی زوو خۆم ئامادە دەکرد تا لە ماڵ دەرچم، سەرلەنوێ دڵم داخورپا.. بەڵام زەلال هاتە بەردەمم و، وتی:

– گیانە، توخوا زوو بگەڕێوە..

کە لە ڕووە مانگئاساکەیم ڕوانی، لە دڵی خۆمدا وتم: "خودایە! لەم بەندە نازدارەت بێ بەشم نەکەیت".

لە کوێوە بزانم ئەمە دوا دیدارە؟

لەکوێ بزانم زۆر نابات و خۆزگە بە مەرگ دەخوازم؟

لەکوێ بزانم دونیا بەسەرمدا دەڕوخێت؟

لەکوێ بزانم؟ ئاخر چۆن بمزانیایە؟

ئەو ڕۆژە ئیشم زۆر بوو و، ڕەنگ بوو درەنگ بکەوم، بۆیە وتم:

– تۆزێك دوادەکەوم، خەمت نەبێت.

تۆی لە باوەشدابوو و، تا بەر دەرگا بەڕێی کردم، کە پشتم تێکرد تا بڕۆم، وتی:

– لەبەر تۆ ئامادەم بەرگەی هەموو فیداکارییەك بگرم، بەڵام بەرگەی نەبوونیت ناگرم.

کە لە ماڵ هاتمە دەرەوە نووسراوێکی دامێ، کە بەمە دەستی پێدەکرد:

– من ئەمانەم زۆر لا جوان بوو، تۆش بیخوێنەرەوە...

ئەمە خوی ئەو بوو و، لە ماڵەوە هەرگیز دەستبەتاڵ نەبوو، لەدوای ئیشی پێویستی ماڵ، یان قورئانی دەخوێندەوە، یان قورئانی فێری ژنی جوتیارەکانی کێڵگەکە دەکرد، یان کتێبی بەسوودی دەخوێندەوە و، هەرچی دێڕێکی لا جوان بووایە بە منیشی دەوت و، دەیویست منیش سوودمەند بم لێیان.

منیش نووسراوەکەم بە دەستەوە گرت و، بەدەم ڕێکردنەوە دەمخوێندەوە:

"هێندە دۆستەکەت خۆش بوێت، کە لەبەرچاوت بێت ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە دوژمنت، هێندەش لە ئاست دوژمنەکەت کینە لەدڵ بە، کە هەست بکەیت ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە دۆستت".

"زانست، بەوە نییە کە تەنها فێری ببیت، بەڵکو بەوەیە کە بەکاری بهێنیت، ئەو زانستەی بۆ سوودی هەموان ناخرێتەگەڕ، وەکو پارەیەکی دڕاوە کە هیچ سوودێکی بۆ خاوەنەکەی نەبێت".

"لووتبەرزیی و خۆبەگەورەزانین، وەك تاشەبەردێکە لە کۆڵی خاوەنەکەی نرا بێت، کە بەهۆیەوە ناتوانێت مەلە بکات یا بفڕێت".

"شەرمکردنی کوڕ مایەی ڕێزە، بەڵام شەرمکردنی کچان زۆر قەشەنگترە؛ خۆشە هەموو کەس دادپەروەر بێت، بەڵام دادپەروەری دەسەڵاتدار زۆر پەسەندترە؛ تەوبەی بەساڵاچووان جێی دەستخۆشییە، بەڵام تەوبەی گەنجان کاریگەرترە".

پارچە کاغەزەکەم بە جوانی قەد کرد و، خستمە سەر دڵم، پاشان کردمە گیرفانی کراسەکەمەوە.

لەبەر ئیشی کێڵگەکە لە شوێنێك کارم دەکرد، کە (١٠) کیلۆمەتر لە ماڵەوە دوور بوو. هەرچیم دەکرد کارەکەم تەواو نەدەبوو و، شەوم لێ داهات، بەڵام شوکر یەکێك لە باشترین ئەسپەکانم پێ بوو.

من ئەو بەیانییە بە خەیاڵی ئاڵۆزەوە لە ماڵ هاتمە دەر ... هەستێکی سەیرم هەبوو، چەندین باسوخواس و ئەگەر سەرقاڵیان کردبووم، هەستم دەکرد ئێستا نا ئێستا هەواڵێکی ناخۆشم پێ دەگات.

ئەسپەکەم خێراو خێراتر تاودەدا و، وەك ئەوەی ئەویش هەستی بەو مەراقانەم کردبێت و تیژڕەو بووبوو.

هێندە دڵم تەنگ بوو، تەنانەت دەتوت ئەسپەکەم بە جەستەیەکی مردووم دەگەیەنێت. دەنگی ناڵی ئەسپەکەم بێدەنگی ئەو دەوروبەرەی شێواندبوو.. خۆیشم نازانم چۆن وا بەخێرایی ماوەی (١٠) کیلۆمەترم بڕی و گەیشتمەوە، لەڕاستیدا ئەو تیژڕەوییەی ئەسپەکەیشم هێندەی تر گومانەکەمی پشتڕاست دەکردەوە.

کاتێك گەیشتمە بەر دەگای ماڵەوە، هێشتا بانگی شێوانی نەدابوو. زەلال هەموو ئێوارەیەك هەر کە گوێی لە دەنگی قاچم دەبوو ڕاستەوخۆ ڕای دەکردە دەرەوە و، بە ڕووە گەشەکەیەوە پێشوازی

لێ دەکردم و، دەیوت: "شوکر ئەوە تۆی؟ هەر چاوم لەسەر ڕێگاکە بوو"، بەڵام ئەو ئێوارەیە کەسی لێ نەبوو و، ماڵ ساردوسڕ و خامۆش بوو.

بەپەلە ئەسپەکەم لەبەردەم ماڵەوەدا بەستەوە و، بە پەشۆکاوی بە قادرمەکاندا سەرکەوتم.

## زەلالیش بووە قوربانیی ڕێی هەستە بێ گەردەکانی:

دەرگا لەسەر پشت بوو، دیاربوو شکێنراوە و، کەسێك بەزۆر چووەتە ژوورەوە.

ئەو هەستەی لە بەیانییەوە خەریکبوو لەناوی دەبردم، وەك بورکان لە دڵمدا تەقیەوە!

بە پەرێشانییەوە هاوارم کرد:

– زەلال گیان..

بەڵام هیچ وەڵامێك نەبوو.

وەکو هەورە بروسکە ڕامکردە هۆدەیەکەوە، هەموو گڵۆپەکانم هەڵکرد.. ئامان خوایە! ئەو ناوە وەك مەیدانی شەڕی لێهاتبوو و، زەلالیش لەناوەڕاستەکەدا خەڵتانی خوێن بوو و، گیانی دەدا.

لەوکاتەدا ئیسماعیل نەیتوانی خۆی کۆنترۆڵ بکات و، وەکو منداڵ دەستی کرد بە گریان و، هەنسك هەڵکێشان.

دیلان خانیش هەردوو دەستی دەکێشا بەسەریدا و، ئۆقرەی لێ

بڕابـوو. بـاوك و كـچ بەلێزمـە فرمێسـكیان دەڕشـت لەبەرانبـەر ئـەم درندایەتیەدا.

دیلان خانیش وەك ئەوەی ڕووداوەكەی بەچاوی خۆی بینیبێـت و، ئێستا برینـی كولابێتـەوە، جلّەوی فرمێسـكەكانی بۆ نـەدەكرا و، بـە ئەشكرشتنەوە دەیوت:

– خۆزگە دایەگیان، ئەوەی بەسەر تۆدا هات بەسەر مندا بهاتایە!

ئیسماعیل ئەفەندیش بە ئاخ و داخ و پەژارەوە دەیوت:

– من نەمتوانی بتپارێزم. مـن نـەمتوانی شـیاوی تـۆبم. تـۆم دایـە چنگی ئەو درندانە. دەرمانی ڕۆحم... ئارامی دڵم، گەردنم ئازاد كە.

كاك ئیسماعیل بەردەوام بوو:

– لەوكاتـەدا كـاس بـووم، نەمـدەتوانی هەناسـە بـدەم.. هـەموو هەستەكانم لە دەست دابوون، ژیانم شێوا. لەوانەیە شێت بوونیش هەر شتێكی وا بێت.

نازانم چۆن، بەڵام وەك باڵندەیەكی بـاڵ شـكاو هێنامـە خـوارەوە. نازانم چۆن هاوارم كـردووە و سـەرم بـە دیوارەكانـدا داوە، هـیچ یـەك لەمانەم بیر ناكەوێتەوە.

چاوەكانی زەلال كراوە بوون و، ڕووخسارە شـیرینەكەی وەك چـرا خامۆش بووبوو... جەستەی بە درندانـەترین شـێوە تێكشـكێنرا بـوو. خوایە گیان، چۆن توانیم بەرگەری ئەو ئەشكەنجەیە بگرم؟

دیارترین پاشماوەی ئەو جانەوەرانەش، ئەو فیشەکە بوو کە نابوویان بە چەناگەیەوە ...

لەو کاتەدا دیلان خان هاواری کرد:

– باوکە گیان بەسە، توخوا بەسە، ئیتر بەرگە ناگرم، شێت دەبم، دڵم دەوەستێت.

ئیسماعیل ئەفەندیش بەهۆی زامی ئەو غەمەی دڵی هەژاندبوو، تەواو تەواو کاس بووبوو و، بە فرمێسک ڕشتنەوە هەر بەردەوام بوو و، خۆیشی نەیدەزانی باسی چی دەکات.

– هاوارەکانم، ناڵەکانم، دەبوو ئەوەندە بەرز بن، هەموو دونیا بیانبیستیێ. بەردەمماڵەکە پڕ بوو لە خەڵك، بەڵام خۆ من هۆشم بەدەوروبەرەوە نەمابوو و، وەك کوێرم لێهاتبوو و، هەر دەمووت: "منیش بکوژن، من ناتوانم بێ ئەو بژیم!"، هەستم دەکرد قیامەت بەرپابووە... نازانم چۆن لەو کاتەدا گوێم لێ بوو ئەو خەڵکەی لەبەردەم دەرگا بوون، وتیان:

– منداڵەکەشی لێ نییە!

ئەمەش وەك ئاگرێکی تر لە دڵمدا کڵپەی سەند.. واتە دووەمین ڕووناکی ژیانیشم فڕیوە؟!

زۆری نەبرد، پۆلیس گەیشتە جێ.

بەپێی وتەی پسۆڕەکانی لێکۆڵینەوەی تاوان:

دیـاره لەکاتێکـدا زەلال قورئـانی خوێنـدووە، پـەلاماریان داوە؛ چونکە قورئانەکە کەوتۆتە زەوی و لەو ناوە کەوتووە.

دیارە یەك کەس لێی نەداوە، بەڵکو وا دەردەکەوێت چەند کەسێك بـوون و، ویسـتوویانە دەسـتدرێژی بکەنـە سـەر، بـەڵام نـەیانتوانیوە سەربکەون و، ئەو خۆی بەدەستەوە نەداوە.

ئـــەم خانمـــە زۆر پەلـــەقاژەی کـــردووە و، زۆریـــان لێـــداوە و ئەشکەنجەیان داوە.

ئەفسەری بەڕێوەبەری بنکەی پۆلیسەکە وەك بـاوکێکی میهرەبـان و بەسۆز هات و، باوەشی پێداکردم، ئینجا وتی:

– رۆڵەکـــەم، مـــن تـــۆ بـــاش دەناســـم، شـــوکر تـــۆ بـــاوەڕدار و لەخواترسیت و، دەزانیت ئەوەی کە مرد ناگەڕێتەوە، باشتر وایە خۆت تەسلیمی ئەو ڕاستییە بکەیت.

دەیشـزانیت شـەهیدەکان ئـازاری گیانکێشـان ناچـێژن، ئـەم ژنـە داوێنپاك و، بێ گوناهە بێ بەزەییانە کوژراوە، لەبـەر ئـەوە لـەخوامان داوایە بە شەهید بینووسێت.

ئەو بەتەنها بە جەستە مردووە، بەڵام بە ڕۆح لە دڵماندا زیندووە.

پاشان ڕووی کردە پزیشکی لێکۆڵەرەوە و، وتی:

– ئەمە چۆن ڕووی داوە؟

– بێ ویژدانانە خنکێنراوە.. دیارە ئەم ژنە سـەرەتا خێنکێنـراوە،

پاشان هەڵواسراوە. بەلای کەمەوە دوو کەس ئەمەیان کردووە.

پاشان ئاوێنەیەکی بچووکی دایە دەست ئەفسەرەکە و، وتی:

– ئەمەش لەو ژوورەدا کەوتبوو. ئاوێنەیەکی کوڕانەیە، دەبێت هی یەکێك لەوانە بێت کە ئەم تاوانەیان ئەنجام داوە.

## ژینێکی سەخت و پڕناسۆریمان لەپێش بوو:

مــن بــە جەســتە لــەوێ بــووم، بــەڵام ڕۆحــم کۆچــی کردبــوو. ڕەشەباکەی خەیاڵم لە مێژەوە منی لەهۆش خۆم بردبوو. لـەو کاتـەدا تەنها یەك پرسیار بە مێشکمدا دەهات:

– کێ ئەمەی کردووە؟

تاکە پرسیاری ئەو خەڵکەی بەردەرگاش هەر ئەوەبوو:

– دەبێت کێ ئەمەی کردبێت؟ یان کەسێکی ڕاسپاردبێت بیکات؟

زەلال گیانمان بە خاك سپارد و، هـەموو خۆشەویستی و خـەیاڵ و خولیا و ئومێدەکانیشم لەگەڵ جەستەی ئەوا ئەسپەردەی خاك کرد..

چەندین ڕۆژ سەرکۆنە و سەرزەنشتی خۆمم کرد و، نەمدەتوانی لە خۆم خۆش ببم.

– هـەر لەبـەر خۆمـەوە دەمـوت: "چـۆن پیـاوێکم، کـە نـەمتوانی ژنەکەم بپارێزم"، بەکورتی وەك تاوانباری سـەرەکی خـۆمم لـە قەڵـەم دابوو.

بە ڕیزکردنی مەترسییەکان لـەپێش چـاوم، دنیـام لـەخۆم کـرد بـە

دۆزەخ و، لەبەر خۆمەوە دەموت:

من کەسێکی بێ کەڵکم، پیاوێکی بێوەفام، ئاخر چۆن تەنانەت خێزانەکەیشم بۆ نەپارێزرا! مرۆڤی وەك من هەر نەبێت باشترە، تازە بۆچی بژیم.

تەنها بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئەو درندەیە بدۆزمەوە و، تۆڵەی لێ بسێنمەوە...

دەبێ بەجۆرێك سزای بەم، کە کڵپەی ئاگری دڵم خامۆش کات..

دەبێ بە سزای خۆی بگەیەنم.

ئەگەر وا نەکەم، هەرگیز لە خۆم خۆش نابم. ئاخر تۆ بەس بیربکەرەوە: کۆرپە تاقانەکەم، لەگەڵ دایکە گەنجەکەی کە خەریکی قورئانخوێندنەوە بووە و، چاولەڕێی مێردەکەی بووە، ئا بەم چارەنووسەیان بردووە.... دەبێ بەو دڵە پاکەیەوە چەند خەیاڵ و خۆزگەی ئاڵوواڵای بۆ ژیانی هەبووبێ؟ کەچی ئاوا لەپێش چاوی کۆرپە سێ مانگەکەیەوە بەم دەردە براوە!

ئاخر چ ویژدانێك دڵی دێت بەڵای ئاوا بەسەر ئەم بێ کەسانەدا بهێنێت؟ چ دەستێك دەتوانێت لەئاستیاندا بەرزبێتەوە؟ چ مرۆڤێك بەرگەی ئەمە دەگرێت؟

لە دوای پێنج ڕۆژ ئەو هەواڵەیان دامێ کە کەمێك فێنکایی بە دەروونی هەڵقرچاومدا هێنا، بیستم تۆیان فڕێ دابووە حەوشەی

مزگەوتێکەوە، کە (٣٠) کیلۆمەتر لە دێکەمانەوە دوور بوو.

ئیتر پێویستە هەم دایك و هەم باوك بم بۆ کچەکەم، لەبەرئەوەی تاقە یادگاریی زەلالیش بوو، بە حەسرەتەوە باوەشم بۆ کردەوە.

ئا لەم تاریکستانەدا حاجی (خەسرەو) ناوێك فریام کەوت و، بە ئامۆژگاریی و پشتیوانیی بێ وچانی ئەو، هاتەوە یادم من کێم و، بەندەی خودای گەورەم.

مامە حاجی خوێندکاری بانگخوازێکی هەڵکەوتوو بوو، منی وەکو کوڕی خۆی پەسەند کرد و، هەرگیز تەنیای نەدەخستم .. بەڕاستی گەر خوای گەورە ئەم مرۆڤە باشەی پێ نەناساندمایە، یان لە زیندان دەبووم یان لەناو گۆڕ.

دیلان خان پرسی:

– باشە باوکە گیان، بکوژی دایکم کێ بوو؟

– بەداخەوە کچەکەم، هیچ ئەنجامێکمان لەو بابەتەدا دەستگیر نەبوو، دیاربوو کە ئەو تاوانە قێزەونەیان بە پیلانێکی زۆر ورد ئەنجام داوە، بەکورتی: ئیشی کەسێکی نەزان نییە.

– مەبەستت لە کێیە؟

– من هەر گومانم لە جەبار ئاغا بوو، کاتێك پاش ماوەیەکیش هات و، داوای لێبووردنی لێ کردم، گوایە ئەو کارە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە و نەبووە، گومانەکانی زیاتر کردم.

بۆ ماوەی چوار ساڵ لای ئەو مامەپیرە میهرەبان و خێرخوایە کارم کرد، ئەویش تەنها بە چاودێری کردن و دڵدانەوەمەوە نەوەستا، بەڵکو دەیویست کچە بەڕەوشت و باشەکەشی وەك دایکێك بۆ تۆ و هاوسەرێك بداتە من.

کچەکەی خانمێکی گەنجی بێگەرد و بەڕەوشت و دیندار بوو، وەك نموونەیەك بوو لە دایکت گیرابێتەوە، منیش شوانێکی تەنهاباڵ و ڕەشوڕووت بووم ...

بەڕاستی دۆستایەتی و نزیکی نواندنی ئەو خێزانە بەخششێکی مەزنی خوا بوو بۆم، واتە مرۆڤی هێندە باش لەدنیادا مابوون؟

– باشە باوکە گیان، دواتر چی ڕووی دا؟

– کچەکەم، ژیانم بە زەلالەوە جوانبوو، وەفا و خۆشەویستی ئەو وا دەروونمی تەنیبوو، کە یەکێکی تر هەرگیز نەیدەتوانی ئەو جێگەیە بگرێتەوە. دڵنیام گەر من بمردمایە و زەلال لە جێی من بوایە، هەرگیز جارێکی تر هاوسەرگیری نەدەکرد و، تا دوا هەناسە بەوەفا دەبوو بۆم و، ناو و نازناومی وەك هێمایەك بۆ وەفای دەپاراست.

کەواتە کە بەمجۆرە ئەوم خۆشویستبێت، دووبارە هاوسەرگیری کردن بۆ من کارێکی شیاو و ئاسایی بوو؟

– بابەگیان، پڕ بەدڵ شانازییت پێوە دەکەم.. ئێرەییش بەو هەموو وەفایەت دەبەم. منیش دەڵێم پێویستە خۆشەویستییەکی وا

مەزن بپارێزرێت... ئای خوایە !

دیلان خان نەیتوانی ڕستەکەی تەواو بکات ... شەرمی لە باوکی دەکرد، چونکە ڕستەکە لە ناخی دڵیەوە بۆ غەریبی شوان بوو و، ئەمەش لە گۆڕانی ئاوازی دەنگیدا هەستی پێ دەکرا.

– کە تەمەنت بووە پێنج ساڵ، ئەو مامەپیرە میهرەبانەیشمان کۆچی دوایی کرد کە ئومێد و ڕۆشنایی ژیانمان بوو.. بەڵام ئێستایش ئامۆژگاری و، وتە بەنرخەکانی وزەبەخشن بۆ بەندایەتی و خۆڕاگری و دامەزراوییمان.

## ئامۆژگارییەکانی ژیان:

دیلان خان ئاهێکی هەڵکێشا و، وتی:

– باوکە گیان، هەندیك لە ئامۆژگارییەکانی ئەو پیاوەم بۆ باس کە، هەر لەخۆوە زۆرم خۆشویست.

کاك ئیسماعیل، دەستی کرد بە خوێندنەوەی هەندێك لە ئامۆژگارییەکانی ئەو پیاوەی بە(سوڵتانی ئامۆژگارییەکان) ناوی دەبرد، کە لە دەفتەرێکدا نوسیبوونی:

* (بسم الله) سەرەتای هەموو خێرێکە.

* نەفسی من لە هەموو کەس زیاتر پێویستی بە ئامۆژگارییە.

* ئەوەی نەتوانێت چاکسازیی لە نەفسی خۆیدا بکات، ناتوانێت چاکسازی لە نەفسی کەسی دیکەیشدا بکات.

* لەم جیهانە فراوانەدا گەورەترین یارمەتی موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی دوعاکردنە.

* گۆڕ هەیە و، مەرگ هەیە و، هیچ کەسێکیش ناتوانێت نکوڵیی لەمە بکات.

* ئەی برادەر! مرۆڤ، بوونەوەریکی بێ کار و، بێ ئامانج و، بێ خاوەن نییە.

* چۆن جەستەی مرۆڤ پێویستی بە ئاو و، هەوا و، خواردن هەیە، ڕۆحیشی پێویستی بە خۆراکی نوێژە.

* ئەوەی گوێ دەگرێت باشتر تێدەگات لەوەی کە قسە دەکات.

* ڕەزامەندی خودای گەورە بە ئیخلاص بەدەست دێت.

* ئەوەی کە پشت بە خوا دەبەستێت، تەنها خودای بەسە.

* ئەگەر ئامۆژگاریت دەوێت، مردن بەسە.

* نەخۆشی وەك صابون، مرۆڤەکان لە پیسی و گوناهەکانیان خاوێن دەکاتەوە.

* ئایا تەنها بۆ ئەم ژیانی دونیایە بەدیهێنراویت، تا هەموو تەمەنتی بۆ تەرخان بکەیت؟!

* کاتت تەواو بوو، بێجگە لە قەبر مەنزڵگەیەکی ترت هەیە؟!

* سەرمایەی تەمەن کەمە، ئیشی باشیش زۆرە.

* ئەو کەسەی کە خۆی بە میوان دەزانێت، دڵی وابەستەی شتێك

ناکات کە نەتوانێت لەگەڵ خۆی بیبات..

* ئەگەر دۆستت دەوێت خودا بەسە، چونکە گەر ئەو دۆست بێت، هەموو شتێك دۆستە.

دیلان خان بە سەرنجەوە وتی:

– باوکە گیان، ئەم وتە کاریگەرانە تەنها لە ژیرییەوە نا، بەڵکو لە دڵەوە سەرچاوەیان گرتووە.

– کچەکەم، ئەم قسانەی کە بە دڵ نووسراون، لە ئایەت و فەرموودەکانەوە وەرگیراون.

حاجی خەسرەویش ئەم وتانەی لە (پەیامەکانی نوور)ی بەدیعوززەمان (سەعیدی نوورسی)یەوە وەرگرتووە، کە شیکردنەوە و تەفسیری قورئانی پیرۆزە.

دیلان خان لە پاش ئەو هەموو دەردەدڵ و گفتوگۆیە، هەستی بە ماندووبوونی باوکی کرد، بۆیە وتی:

– باوکە گیان ئیتر کاتی پشووت هاتووە، بەڵام لەبەرئەوەی جەبار ئاغا پیاوێکی وا بێویژدانە، با بیرێك لەوە بکەینەوە کە چۆن سبەی قسەی لەگەڵ بکەین.

– قسەکردن لەگەڵ ئەودا وەك مرۆڤ، یا باسکردنی شتێك لەگەڵیدا مەحاڵە. ئەو تەنها ئەوە دەکات کە لە مێشکیدایە، گەر نەشیکات،

پیلانــی بـۆ دادەڕێـژێت و، بەشـێوەیەکی دڕندانـە بـە کەسـانی تـری دەکات.

– کەواتە؟

– کەوایـە ئێمـە تـەنها گـوێ دەگـرین و، میـوان پەروەرییەکـەمان پیشان دەیەین، دڵنیام دێت بۆ خوازبێنی تۆ بۆ کوڕەکەی.

– خوا نەکات! خوایە لامان دەیت لە بوونە بووکی پیاوێکی وا...

دیـلان خـان بـەم گومانــەی بـاوکی دڵــی داخورپـا. تەنانــەت هاوسەرگیرییەکی وا بە خەیاڵیش تەزووی بە گیانیدا دەهێنا.

– ئەم نامرۆڤە، هەستی کردووە غەریب هەستێکی تایبەتی بۆ تـۆ هەیـــە، بۆیـــە ڕێگـــای پـــێ دەگرێـــت و، هەڕەشـــەی کوشـــتن و شاربەدەرکردنی لێ دەکات، دەیەوێت بە پیلانێکی گڵاو بە زۆر تۆم لە چنگ دەرهێنێـت...

– جـا باوکـە گیـان، بـە چ ڕوویەکـەوە لـە دەرگامـان دەدا؟ چۆن دەتوانێت ڕابردوو لەبیر کات؟ بکوژی دایکم، چۆن دەتوانێت خوازبێنی کچی ئەو زەلالە بکات، کە کوشتویەتی؟

– کچەکەم ئەمەی کە تۆ دەیڵێیت بۆ کەسێکە کـە عـەقڵی لەسـەرا بێت، دەنا کەسێکی دەروون نەخۆشـی وا، –حاشـا– خـۆی بـە خـودا دەزانێت؟

کاك ئیسماعیل نەیدەویست کچەکەی لەوە زیاتر بێتاقەت بێت، بۆیە وتی:

– دەی کچەکەم، تا بەیانی خوا خۆی دەمێنێ و موڵکی، با بزانین ویستی خودای گەورە چۆنە بۆمان.

ئەگەر لەمە زیاتر قسە بکەین نوێژەکەمان لە دەست دەچێت.

چ بەڵایەك!:

بۆ ڕۆژی دواتر هەمووان لە دوێنێ جیاواز بوون.

بۆ دیلان خان ڕۆژێکی نوێ و، بۆ کاك ئیسماعیل تاقیکردنەوەیەکی دیکە و، بۆ غەریبی شوانیش داستانێك دەنووسرایەوە.

دەمەوبەیانی ئەو ڕۆژە کاك ئیسماعیل غەریبی لە خەو هەستاند و، بەم وشانە ڕەوانەی کرد:

– ئەمڕۆ زیاد لە جاران ئاگات لەخۆت بێت. خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ، مەترسە، تا ئێمە لە ژیانا بین، تۆ یەکێکیت لە ئێمە.

ئەم قسانەش کاکەی شوانیان کەمێك ئاسوودە کرد.

غەریبی شوان ملی تولەڕێی بەرەو چیاکانی گرتەبەر.. بەدرێژایی ئەو ڕۆژە ئەم نزایەی دەکرد: "خوایە گیان، دیلان خان بکەیتە نسیبم، خودایە".

سەیری ئەم قەدەرە بکەن، دووبارە هەمان گەمە لە مەیداندایە،

واته لەوە دەچوو غەریبی شوانیش لە هەمان تاڵاو بچێژێت کە کاك ئیسماعیل سەردەمانێك چەشتبووی.

تاریك و لێڵی شێوان لە دەرگا درا و، جەبار ئاغا بە دەستێك جلی زۆر گرانبەها و، بە کەشخەیی کردنەوە خۆی کرد بەژووردا ...

بە جووتێك پێڵاوی تازە و، چارۆکەیەك لەسەر شان و، کاتژمێرێکی ئاڵتوونی لە دەستیدا، دیاربوو کە بەرگەکەی لە گرانبەهاترین قوماشەکانی ناوچەکە دروست کرابوو.

دوو پیاویشی لە دواوە بوو ... یەکێکیان پیرە مەلایەك و، ئەوی تریان گەنجێکی توورە و ڕووگرژ، کە زۆری لەخۆی دەکرد میهرەبان دەربکەوێت.

– سەلامو عەلەیك ئیسماعیل ئەفەندی.

کاك ئیسماعیلیش ناچاربوو وەك خاوەن ماڵ پێشوازی لێ بکات و، وتی:

– فەرموون.

– تۆ هێشتا لەناو ئەم داروبەردەدا دەژیت، پیاوێکی چاك و پاکی وەك جەنابت، پێویستە لە شوێنی شاهانەدا بژی.

کاك ئیسماعیل دەیزانی لە ژێر ئەم زمانە شیرینەیدا چ پیلان و ژەهرێکی مەڵاس داوە، بۆیە چاوی لە زەوییەکە بڕی و، لەبەر خۆیەوە وتی:

- خۆ کۆشك و تەلار مرۆڤ ناکەن بە پیاو.

- بەس من دەتناسم ئیسماعیل ئەفەندی، دەزانم سەر بۆ هیچ شتێك نەوی ناکەی، باشە قەت لە ئارام گرتن بێزار نابی؟ لەڕاستیدا هەر لەبەر ئەمە زۆر ڕێزی حەنابتانم لایە.

پاشان جەبار ئاغا و پیاوەکانی هاتنە ژوورەوە..

لەبەرئەوەی پێشتر باوك و کچ ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەی دیلان خان نزیکی ئەو ناوە نەکەوێتەوە، کاك ئیسماعیل خۆی هەموو ئەرکی میوانداریی لە ئەستۆ گرتبوو.

کاتێك جەبار ئاغا هەستی بەمە کرد، وتی:

- دیارە کچە نازدارەکەتان لێرە نییە.

- تۆزێك نەخۆشە، لەبەرئەوە نەهات بۆ بەخێراتننتان.

جەبار ئاغا لەبەر خۆیەوە وتی:

- هممم ...

پاش چا خواردنەوە، جەبار ئاغا بە درۆ و زمانە ڕێوی ئاساکەی چووە سەر باسی بابەتە سەرەکییەکە:

- من لەوەتەی هەم ڕێزی تۆم لابووە. با دنیاش لە هەندێك ڕووداوی ناخۆشدا بەگژیەکیدا کردبێتینەوە، بەڵام خۆ لەکۆتاییدا دانمان بە هەڵەی خۆماندا نا و، داوای لێبووردن و گەردن ئازاییمان کرد، کێڵگەکەیشمان دایە دەستتان و، کارێکی باوکانەمان کرد. ئەگەر

ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەی ئەو دەموزەمانە نەبووایە ئێستاش ئاغای ئەوێ دەبووی.. هەرچۆنێك بێت خۆتان زانیوتانە کە نییەتمان خێر بووە.

ئا لەم قسانەدا بەرچاوی کاك ئیسماعیل تاریك بوو و، ئەو ڕووداوانەی هاتەوە یاد کە بەهۆی جەبار ئاغاوە بەسەریدا هاتبوو: هەر ئەم نەبوو میلی چەکی لێ هێنامەوە و، فیشەکی پێوەنام.. ئەی مەرگی جەرگبڕی زەلال و، ئەو هەموو تالاوەی پێی چەشتین؟ ئێستاش هاتووە و پیاوی ناو پیاوانە!

دەیویست هەرچۆنێك بێت هێمنیی خۆی لەدەست نەدات و، لەدڵی خۆیدا دەیوت: "جڵەوی خۆت بکە، تۆ چیتر گەنجەکەی جاران نیت و، ئەویش لە ماڵی تۆ میوانە، گەر دوژمنیش لە ماڵەکەتدا میوان بێت، دەبێ ڕێزی لێ بگریت".

جەبار ئاغا دوو سێ جار وتی:

– وانییە ئیسماعیل ئەفەندی؟

بەڵام کاك ئیسماعیل لە خەیاڵەکانیدا کاس بووبوو.

– خێرە ئیسماعیل ئەفەندی؟ خەیاڵت بۆ کوێ ڕۆیشتووە؟ شتێ بووە؟ خۆ خۆت باش دەمناسیت، ئیتر ئێمە دۆست و برای یەکین. تۆ بەس فەرمان بکە، هەر کێشەیەکتان هەبێت چارەی دەکەین.

دووبارە کاك ئیسماعیل لە دڵی خۆیدا وتی: "وەڵا باش

دەتناسم".

جەبار ئاغا دوای دوو سێ کۆکە وتی:

- جا با بێینە سەر هۆکاری هاتنمان.. بە ناوی خوا و لەسەر سووننەتی پێغەمبەر (د.خ) هاتووینەتە خوازبێنی دیلان خان، ئینشائەڵڵا وەڵامی ئێوەش (بەڵێ)یە.

پێشینان وتویانە چی؟ ئا، "بەرد لەجێی خۆی سەنگینە".

شێوەی قسەکردنەکەی بەتەواوەتی بەو واتایە دەهات: "گەر بە قسەی خۆش نەماندەیتێ، بەزۆر لێت دەسێنین".

- خۆت ئەزانیت من دەسترۆیشتووترین ئاغای ناوچەکەم و، هەموو کەس و شت و دەستەڵاتێکم بەدەستە و، هەمووان خزمەتکاری منن، بەڵام بەم هەموو شانوشەوکەتەشەوە ژیان بەتەنیا بەسەر نابرێت و، فەرزە لەسەرم لە دوای مردنی ژنەکەم کچێکی باش بکەمە هاوسەرم، هەر بۆ ئەمەش لە دەرگام داویت.

کاك ئیسماعیل باوەڕی بەوە نەدەکرد کە دەیبیستێت، قورگی وشك بووبوو: "ئامان خودایە! کەوایە ئەم پیرەمێردە هاتووە بۆ خوازبێنیی کچە (١٨) ساڵانەکەم بۆ خۆی؟". لە سەرسامیی و تووڕەیدا تەنها لە دڵی خۆیدا دەیوت: "لا حول ولا قوة إلا بالله، خوایە گیان ئەم بەڵایەمان لە کۆڵ کەیتەوە".

– ئیسماعیل ئەفەندی، بۆ هیچ نالێی؟ لەوەتەی هاتووین، زارت هەڵنەپچڕیوە...

– ئەوە چەند ساڵە گوێ لە تۆ دەگرم، بەڵام هەر ئەو ڕۆژەی تۆم ناسی، بڕیاری خۆمدا و، خوا ئەو ڕۆژە نەهێنێتە ڕێم کە بە دۆستایەتی یا خزمایەتیت شاد بم!... خوا لەو بەڵایە لامان دات.

– مەگەر دەتەوێت بڵێیت چی ئیسماعیل ئەفەندی؟ بەدوای شیری ڕژاوا مەچۆ، من ئیتر وا نەماوم و، تەوبەم کردووە، تەنانەت دەچم بۆ نوێژی هەینیش.

تۆش ئەوەندە ئەو قەوانە کۆنە لێ مەیەرەوە و، ڕابردوو لەبیر کە، ئێستە ژیان گۆڕاوە و، پەڕەیەکی سپیم هەڵداوەتەوە، هەر بۆیە دەمەوێت کچێکی دیندار بخوازم و، ئامۆژگاری و وانەی تازە لەسەر دین و ژین فێربم.

پاشان ڕووی کردە پیرەپیاوەکەی تەنیشتی و، وتی:

– وانیە حاجی گیان؟

– بەدڵنیاییەوە ئاغا، قسەکەتان جوانە.

– سەیرکە، مامۆستاش شایەتی بۆ قسەکانم دەدا.

زەكات دەدەم، چاوێكم لە هەژارانە، خۆ هەمووان لە دەسودڵم بەهرەوەرن، بەڵام من دەمەوێت سوود بە پیاوچاك و خواناسی وەك ئێوە بگەیەنم.

لەو كاتەدا ڕووی كردە كاك ئیسماعیل و، بەردەوام بوو:

– بەتایبەت جەنابت، دەتكەمە خاوەنی كێڵگەكەم و، تاپۆكەی دەكەم بە ناوتەوە. لە ئیسماعیل ئەفەندییەوە دەبیت بە ئیسماعیل ئاغا.

ئا! بیرم چوو، چەندتان بوێت مارەیی، زێڕ، زەماوەندێكی شاهانە، ئێوە بەس ئەمركەن با لە خزمەتتاندا بم...

بە ئیمانم، ئیتر دەتكەمە ئاغا بەسەر خۆیشمەوە.

كاك ئیسماعیل لە دڵی خۆیدا دەیوت: "ئیمانت ها؟ كام ئیمان؟ ئەوەی كە هەر بۆنیشت پێوە نەكردووە؟ هێی دنیا.. وەڵا خۆش جەبار ئاغا".

لەكۆتاییدا بەرگەی نەگرت و، وەك ئەوەی بڵێت "ئیتر بڕۆ ون بە لەبەرچاوما، لەمە زیاتر ماستاوم بۆ مەكە" وتی:

– جەبار ئاغا، ویستتان سەردانمان بكەن، ئێمەش قبوڵمان كرد؛ نیازتان ڕوونكردەوە، ئێمەش بە ڕێزەوە گوێمان لێ گرتن، بەڵام ئێستا تۆ گوێ لە من بگرە.. من كچم نییە بیدەم بە تۆ. وام لێ مەكە قسەی ناخۆش بكەم، نسیبی خۆت لە جێگەیەكی تر بدۆزەوە.

ئا لێردا جەبار ئاغا قسەکانی پێ بڕی و، وتی:

– ئیسماعیل ئەفەندی، من پێشنیاری بەهەشتم بۆ کردوون، کەچی ئێوە لەقە لە بەختی خۆتان دەدەن. جارێ بیر لەوە بکەنەوە چی لە کیس خۆتان دەدەن. پەلە مەکەن، هەفتەیەکی تر لەگەڵ مامۆستادا سەرێکتان لێ دەدەینەوە.

کاک ئیسماعیل هەناسەیەکی قوڵی دا و، هەرچۆنێك بوو وتی:

– ئێمە قسەی کۆتایی خۆمانمان کرد ...

جەبار ئاغا پەنجەی شایەتمانی بەڕوویدا بەرز کردەوە، بەشێوەیەك کە بیەوێت هەڕەشە بکات، پاشان وتی:

– سەیرکە ! خۆت باش دەزانیت من فێر نیم وەڵامی نەخێر وەربگرم.

کاک ئیسماعیل دەنگی بەرز کردەوە و، وتی:

– جەبار ئاغا ! ئێمە قسەی کۆتاییمان کرد. لەڕێی خوا بەرۆکمان بەردە.

لەو کاتەدا جەبار ئاغا ڕووخساری ڕاستەقینەی خۆی دەرخست و، بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد:

– من ئاغام، هەرچیم بوێت تا نەیخەنە مشتمەوە ناڕۆم، ئەم قسەیەشم بکەنە ئەڵقە و بیکەنە گوێتان.. هەفتەی داهاتوو لەمماڵەدا هەموو شتێك دەبڕێنینەوە و، مارەکردنیش تەواو دەکەین، کێش

بەدڵی نییە، خوێنی خۆی لەسەر خۆی. وابزانم ئەم چەند ساڵەی ڕابردوو ئەمەم باش تێگەیاندووی ئیسماعیل!

کاک ئیسماعیل هەموو ئاخوداخی تەمەنی ڕابردووی هاتەوە پێش چاو و، لە دڵی خۆیدا وتی: یەعنی بێ هیچ شەرم و شکۆیەك بەڕۆژی ڕووناك خۆی دانی بەو تاوانەدا نا.

کاک ئیسماعیل بە پەنجە ئاماژەی بۆ دەرگاکە کرد و، وتی:

– دیارە قسەکانتان تەواو بوو ئاغا، ئەگەر باشیش گوێت لێ نەبوو بۆت دەڵێمەوە: "من کچێکم نییە بیدەم بە تۆ".

– خۆم دەزانم چۆن لێت دەسێنم، یا ئەڵڵا، مامۆستا دیارە ئەمانە جارێ ئاقڵ نەبوون، هەفتەی داهاتوو دێینەوە بۆ دیداریان.

بە پێچەوانەی هاتنەژوورەوەکەی، ڕووپۆشی میهرەبانی فڕێ دابوو و، بە توندی دەرگاکەی دایەوە بەیەکدا و، ڕۆیشت.

## ترس و ئومێد:

دیلان خان لە پشت دەرگاوە گوێی لە هەموو قسەکان بوو، بۆیە کە ئەوان ڕۆیشتن خۆی هاویە ئامێزی باوکیەوە و، بە گریانەوە وتی:

– چی بکەین؟ چۆن لە شەڕی جەبار ئاغا ڕزگارمان بێت؟ ئەم پیاوە لە هیچ سڵ ناکاتەوە و، شەڕ بە ناوچاوییەوەیە، بەخوا بشمرم ڕازی نابم شووی پێ بکەم.

کاک ئیسماعیل بەشێوە میهرەبانەکەی خۆی دەستی هێنا بەسەری کچەکەیدا و، وتی:

– ڕۆڵە گیان، ئەگەر جەبار ئاغا هێز و دەسەڵات و دەستوپێوەندی هەیە، ئێمەش خوا شك دەبەین. مەترسە ! ئێمە خوامان لە پشتە، جارێ هەفتەیەکمان لەبەردەستایە، تا ئەوکاتەش خوا خۆی دەمێنێ و موڵکی...

ئەو شەوە خەو لە چاوی کاك ئیسماعیل تۆرابوو، هەر بیری لەوە دەکردەوە جەبار ئاغا چی دەکات و چی لە دەست دێت.

چۆن دەتوانێت بەگژی پیاوێکدا بچێتەوە ؟ کە چی بخوازێ دەیکات، تەنانەت بێ چاوترووکان دەتوانێت بێ ویژدانانە کەسێك بکوژێت !

بەم خەیاڵانەوە کەمێك چاوی چووە خەو، لە خەونیدا حاجی خەسرەوی بینی و، پێی وت:

– ڕۆڵە، بۆئەوەی دەستت بە خوێنی خەڵکی سوور نەکەیت، سەری خۆتان هەڵگرن و بڕۆن، لەجیاتی ئەوەی لەگەڵیدا بەشەڕ بێن، بارگەوبنەتان بپێچنەوە و، لە شوێنێکی تر ڕزقی خۆتان پەیدا کەن.

پاشــان خەبــەری بوویــەوە.. لــە كۆتاییــدا ڕێگەچــارەیەكی دەستكەوت، هەرچەندە لە شوێنێكی دیكە دۆست و ناسیاوی وای شك نەدەبرد.

بـۆ ڕۆژی دواتـر ئـەم بابەتـەی لای دیـلان خـان و غـەریبی شـوان كردەوە، ئەوانیش ناچار پێی قایل بوون.

لـە زووتـرین دەرفەتـدا لـە یـەكی مـارەكردن، پاشـان باشـترینی ئەسپەكانیان ئامادەكرد، كاك ئیسماعیل پێی وتن:

– شەو دەكەونە ڕێ، بۆ شوێنێك نزیكەی (٣) كاتژمێر ڕێ لێـرەوە دوورە.. كە گەیشتنە جێ، ئەسپەكە بفرۆشـن، پارەیـەكی باشـتان بـۆ دەكات، لێشتان سەروزیاد دەبێـت. بـەم پارەیـە بچـن بـۆ (ئەنقـەرە)، لەوێ هاوڕێیەكی خۆشەویستی سەردەمی سـەربازیمی لێیـە. پیـاوێكی بەوەفایە، بیدۆزنەوە و، كە چوونە لای ئـەم نامەیـەی بدەنـە دەسـت، ئەو كۆمەكییتان دەكات.

دیلان خان بە پەشێواوی و مەراقەوە وتی:

– ئەی تۆ بابـە؟ مـن نـاتوانم تـۆ لێـرە بەتـەنیا بـەجێ بـێڵم، ئـاوا دەبیتە خۆراكی ئەو دڕندانە.

– مەترسـە ڕۆڵەكـەم، منـیش پەنایـەك بـۆ خـۆم پەیـدا دەكـەم. ماوەیـەك كارەكـان بـە ئەمانـەت بـە یاسـینی شـوان ئەسـپێرم، كـە بارەكەش ئاسایی بوویەوە خوا كەریمە.

– ئاخر بۆ کوێ دەچیت؟

– بۆ زۆر دوور ...

دیلان خان بەم وتەیە هێندەی تر ناڕەحەت بوو:

– باوکە، ئەگەر من نەزانم دەچی بۆ کوێ، لە مەراقا دەمرم، هیچ نەبێ تەنها ناوی ناوچەکەمان پێ بڵێ، ئەگەر ویستمان سەردانت کەین.

– زۆر لە مێژە نیەتم هەبوو بچم بۆ ئەوێ، ئەمەش بوو بە هۆکار.

ئینشائەڵا بۆ ماوەیەك دەچم بۆ (مەککە و مەدینە)، ئەگەر کارێکی زۆر گرنگیش نەیەتە پێش، دەمەوێت بۆ هەمیشە لەوێ بمێنمەوە.

– باشە ئەی ئێمە؟

– ئینشائەڵلا، ئێوەش دێن بۆ سەردانم.

خواحافیزی لێ کردن و، بە فرمێسك باران بەڕێی کردن:

– کە گەیشتنە جێ، پارەشتان بۆ دەنێرم.. خواتان لەگەڵ، لە ئەمانەتی خوادا بن.

# بەشی سێیەم



## خەونە بەدیهاتووەکان..

## دونیا ڕووخاوەکان

**سەفەر بەرەو ژینێکی نوێ:**

ئەو دوو گەنجەی لە مێژە هەستەکانیان پەردەپۆشکردبوو، لە خۆشی ئەوەی کە ئەم چاوەڕوانییەیان کۆتایی پێ هات و، بوونە حەلاڵی یەکدی، کەوتنەڕێ و، تا باوکیان لەبەر چاو ون بوو، ئاوڕیان بۆ دایەوە و، فرمێسکیان ڕشت.

ئیسماعیل ئەفەندیش تا توانی دوعای خێر و بەختەوەربوونی بۆ کردن و، بەخوای سپاردن.

ئەم خێزانە بچووکەش -کە ئەو دەرفەتەیان بە ڕزگاربوونی سەرتاسەری دەزانی- لەکوێ بیانزانیایە چ ڕۆژگارێکی ڕەشیان لەپێشە. پێشینان ڕاستیان وتووە: "مار بسرەوێت، دوژمن ناسرەوێت!"، بەڵام ئەوان ئەمەیان لە کاتێکی زۆر هەستیاردا لەیاد

کـرد، لەبەرئـەوەی هـەرگیز بـە خەیاڵیانـدا نـەهاتبوو سـەرئەنجامی کارەکەیان هێندە سەخت بێت.

وا دەزانن جەبار ئاغا هەر وا بە ساویلکەیی چاو لـە کەسێ خافـڵ دەکات کە مەبەستی بێت؟

کاك ئیسماعیل بۆ هێورکردنەوەی ئازار و فشارەکانی لێکدانـەوەی خەیاڵەکانی، چوو بۆ مزگەوت.

کاتێـك پـاش نوێـژی عیشـا، لـە مزگـەوت هاتـە دەرەوە و، ڕێـی ماڵەوەی گرتەبـەر، دوو گـەنج هاتنـە سـەر ڕێـی و، بـێ ورتـە هـەردوو قۆڵیان گرت:

– ئاغامان تۆی دەوێت.

– ئاغاتان کێیە؟

– خۆت زۆر باش دەزانیت، خۆت گێل مەکە!

ئا بەو تاریکەشەوە هێندەیان لێ دا، تا لە هۆش خۆی چوو.

کاتێـك کـاك ئیسـماعیلی بەسـتەزمان هاتـەوە هـۆش خـۆی، بـە سەختیی پێڵووی چاوەکانی هەڵبڕی، بینی بردوویانەتە ئەشکەوتێك لە چیایەکی سەخت و هەورازاوی –کە سێ کیلۆمـەتر لـە گوندەکەیانـەوە دوور بوو–، لای خەڵك بە چیای جنۆکەکان ناسرابوو.

دەستەکانی بەسترابوونەوە، سێ پیاوی دڕندە و ڕووگـرژ دەوریـان دابوو، دووانیان ئەوانە بوون کە لەبەردەم مزگەوتدا فڕاندبوویان.

کاک ئیسماعیل هاواری کرد: "چیتان لە من دەوێ؟"، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، تا پاش کەمێك جەبار ئاغا هاتە ئەشکەوتەکەوە و بە دەنگێکی زبر و پڕهەڕەشەوە وتی:

– دیارە لەسەروو ئەو هەموو کولەمەرگییەتەوە، هێشتا نەتزانیوە ئێمە کێین؟ کەس ناتوانێ بە من بڵێت "نەخێر"، خۆ کەس ئەمەی نەزانیایە، دەبوو تۆ لە هەموو کەس باشتر بیزانیت، وامدەزانی یەك تۆز عەقڵت لە کەللەدایە، بەڵام دیارە باش تێ نەگەیشتووم و، تۆ هێشتا تەواو منت نەناسیوە.

تازە چی بکەم؟ خۆت بەخۆتت کرد، دەبێت خۆشت تاڵاوەکەی بچێژیت.

کاک ئیسماعیل لەتاو ئازار لە پەلوپۆ کەوتبوو، بەڵام ئەو ئاغا بێ ویژدانە لە هەڕەشەکانی بەردەوام بوو:

– چۆن دەوێریت دەست بەڕووی ئاغایەکی وەك من بە شانوشەوکەتەوە بنێیت؟ کەچی کچەکەت دەدەیتە دەستی شوانێك کە دوو پولی لەگیرفانا نییە؟ واتدەزانی منیش وەك مەڕی مردوو دادەنیشم و ئافەرینت بۆ دەکەم؟! مەگەر نازانیت داروبەردی ئەم ناوچەیە لە چنگی خۆمایە؟ تەنانەت دەبێ ئەو باڵندانەش کە بە ئاسمانی ئەم ناوەیا دەفڕن، ئیزنی من وەرگرن.

پاشان بە هەموو هێزی دڕندانە لەقەیەکی لە کاک ئیسماعیل دا و، وتی:

– سەیری من کە، بێ سێ و دوو کچەکەت دەدۆزیتەوە و، لێم مارە دەکەیت، دەنا هەرسێکتان دەکەمە قوربانی لوولەی تفەنگەکەم.. وابزانم کەسیش لە تۆ باشتر نازانێت ئەمە چۆن دەکەم. ئێستە بە قسەی خۆش بڵێ بزانم چووە بۆ کوێ؟

کاک ئیسماعیل لە ئاست ئەم زەریای بێ ویژدانی و دڕندەییەی ئاغادا وتی:

– هەزار جار بمرم پێم باشترە لەوەی کچە تاقانەکەم بدەم بە خوانەناسێکی وەک تۆ، کە نازانێت دین و خودا و ویژدان چییە.

جەبار ئاغا فەرمانی بە پیاوەکانی کرد:

– لێی دەن، تەمێی کەن بۆم، با دڵم ئاو بخواتەوە. دەبێ لەوە تێبگات ئەوەی لاساریی لە سەر قسەی من دەکا، بە چ دەردێکی دەبەم.

یەکێك لە پیاوەکان بە ڕووی کاک ئیسماعیلدا میلی چەکەکەی هێنایەوە و، هەڵوێستەیەکی کرد.

جەبار ئاغا نەڕاندی بەسەریدا:

– بیکوژە هەتیو، بیکوژە، دەنا تۆشی لەگەڵدا دەتۆپێنم.

پیاوەکە ڕووی چەکەکەی کردە جەبار ئاغا و، هاواری کرد:

– بەسە ئیتر.. ئەوەندە کەسی بێ تاوانم کوشت، بووم بە ئاژەڵ. ڕقم لێتە. کە دەتبینم دڵم بەیەکدا دێت، لەوە زیاتر مەمکە بە هاوبەشی کارە چەپەڵەکانت! شەو تابەیانی کابووس دەبینم!

زەلالی بێ تاوانت بە من هەڵواسی و، محەمەد و حەسەنیشت بە من کوشت. بەڕاستی نەفرەت لە خۆم و تۆش دەکەم. هۆشم بەخۆمەوە نەماوە، کەس چارەی ناوێم؟ بەڵام هیچ نەبێت گەر بتکوژم دڵم ئاو دەخواتەوە.

– ئەوە چی دەکەی بێ عەقڵ؟ شێت بووی؟ کەس تفەنگ لە ئاغای خۆی بەرز دەکاتەوە؟

جەبار ئاغا بە ترس و لەرزەوە بە پیاوەکانی وت:

– بیکوژن، بیتۆپێنن بۆم..

لەوکاتەدا فیشەکێك ڕاست بەر نێوچاوانی کەوت.. ئەو خوێنمژە – کە دەستی بە خوێنی چەندین کەسی بێتاوان سووربووبوو– کەوتە سەر زەوی ...

کاك ئیسماعیل کە شایەتحاڵی ئەمە بوو، هاواری کرد:

– خودایە! تۆ خۆت تەنها پەنای ستەملێکراوانی، دادپەروەرترینی، هەقی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵی.

ئەو شەوە لە خەونیدا زەلال خان پێی وت:

"من دوور نیم، هەمیشە لێت نزیکم، بەدرێژایی ئەم چەند ساڵەی

ڕابردووش لەگەڵت بووم.. ئیتر وەرە، خۆ لە دونیادا تەنیا کەوتیت، لەمە زیاتر من لە چاوەڕوانیتدا مەهێڵەوە. زۆر بیرم کردوویت، خێرا وەرە".

کاک ئیسماعیل کە هەستا لە خەو بینی لە کۆتایی ڕێگە دوورەکەی ژیانییەوە بە دیداری زەلالی تاقە هاودەم و هاوسەفەری شاد دەبێتەوە، بۆیە زۆر دڵخۆش بوو و، سوجدەیەکی شوکرانەبژێری بۆ خوای بەخشندە برد، چەندین شەو تا بەیانی سەری لەسەر بەرماڵ بەرز نەکردەوە...

### ئەو بە یارەکەی شادبوویەوە:

هەرچەندە غەریبی شوان و دیلان خان لەلایەن دەستەیەك پیاوی جەبار ئاغاوە چاودێری دەکران، بەڵام لە کۆتاییدا نەیان توانی زیانیان پێ بگەیەنن، بۆیە بێ هیچ کێشەیەك توانییان بگەنە (ئەنقەرە)، لەوێ بە کۆمەکی هاوڕێکەی کاك ئیسماعیل لە ماوەیەکی کەمدا ژیانێکی سادە و ئارامیان پێکهێنا، بەڵام دوای چەند مانگێك لەم ژیانە ئاسوودەیەیان هەواڵێکیان پێگەیشت.

کاک ئیسماعیل چووەتە شاری مەککەی پیرۆز و، لە کەشی ئارام و ئیمانی حەوشی کەعبەدا، ڕازونیازی چەندین ساڵەی ناخی خۆی لە خزمەت خوای گەورە درکاندووە، بەڵام چیتر توانای بەرگە گرتنی

ژیانی تەنیایی نەماوە و، کۆچی دوایی کردووە و، بە پارەکەی شادبووەتەوە.

واتە خودای گەورە مردنێکی هێندە شاهانە و سەربەرزانەی کردووەتە نسیبی!

کاتێک دیلان خان ئەم هەواڵەی پێگەیشت بەدەم هەنسک هەڵکێشانەوە، دەیوت:

"باوکە گیان، تۆ گەیشتیت بە دۆستەکەت، ئا بەم مردنەت سەلماندت چ بەندەیەکی خۆشەویستی خودایت، بەڵام ئێمە بێ تۆ چیمان لێ بەسەر دێت؟" .

دیلان بۆ ئازاری دابڕانی لە باوکی میهرەبان و ئازیزی چەندین ڕۆژ ماتەم دایگرت.

بەرەنگاربوونەوەی غەریب و دیلان لەگەڵ سەختییەکانی ژیان لە شارێکی وا گەورەدا ئاسان نەبوو، ژێرزەمینێکیان بە کرێ گرتبوو و، تێیدا نیشتەجێ بووبوون، کە کرێکەیان بە هەزار چەرمەسەری دەست دەکەوت، غەریب وەک کرێکارێکی ژینگەپارێز شەقامەکانی خاوێن دەکردەوە، دیلانیش دەچوو بۆ خاوێنکردنەوەی ماڵان.

کاتێك دەمەو ئێوارە ئەم دوو دڵە دێوانەیە بە یەك دەگەیشتنەوە، وەك ئەوەی لە بەهەشتدا بژین و بێ هیچ نارەزایی و گلییەك لە بەختیان سوپاسگوزار بوون.

ئێوارەیەك دیلان خان پێش ئەوەی غەریب بێتە ماڵەوە، بە مژدەیەك پێشوازی لێ کرد:

– خودا منداڵێکی کردووە بە نسیبمان.

ئەو ئێوارەیە، ماڵەکەیان لێوان لێو بوو لە شادمانی و کامەرانی و، نزا و پاڕانەوە و، سوپاسگوزاری لە پای ئەو کوڕە شیرینەی کە لەو ساتەوە ناویان نابوو ئازاد، تا لە گوناه و، هەڵە و، نەزانی ئازاد بێت و، دووربێت لە هەموو کارێکی نەشیاو...



# بەشی چوارەم



## ناوم (ئازاد)ە!

**بۆئەوەی ببمە کەسێکی باش:**

ناوم ئازادە، منێك کە بەر لە لەدایکبوونم لەپێناو ڕزگاربوونم لە بەدکاریی و، سەرکەوتوو بوونم لەداهاتوودا ئەم ناوەیان بۆ هەڵبژاردبووم، ئەو ڕۆڵەیە بووم کە شەو و ڕۆژ ئەندێشەی دایك و باوکی ڕازاندبووەوە.

سەرگوزشتەی بەیەك گەیشتنی دیلان و غەریب لە داستانێك دەچوو، دیلان دەستبەرداری ژیانی ئاسوودەیی خۆی بوو بوو و، شانبەشانی غەریب بۆ پەیدا کردنی بژێوی ڕەنجی دەکێشا و، بەو دووگیانییەیەوە دەچوو بۆ پاککردنەوە و شۆردنی قاپ و قاچاخی ماڵان.

دایك و باوکی بەستەزمانم، بەو هەموو چەرمەسەرییەشەوە بە هەزار حاڵ کرێی ئەو ژێرزەمینە تەسك و تارەیان پەیدا دەکرد کە تێیدا دەژیان.

باوکم هەواڵی لە کۆنە هەوارەکەیانەوە پێ گەیشت کە پیاوەکانی جەبار ئاغا، هەڵیان کوتاوەتە سەر بکوژەکەی جەبار ئاغا و، کوشتوویانەتەوە، دواتر دەستیان بەسەر ماڵ و موڵکی باپیرمدا گرتووە، بەڵام خودا ڕەحمی کردووە، ناونیشانی ئەمانیان دەست نەکەوتووە.

بەپێی یادگارییەکانی دایکم، هاتنە دونیام بەتەواوەتی جەژنێك بووە بۆ خێزانۆچکەکەمان، باوکم کە ئێواران دەگەڕایەوە ماڵ، دەیوت: "با تۆزێك زیاتر یاری لەگەڵ بکەم، زیاتر خۆشم بوێت"، دایکیشم وەکو چاوی خۆی بەخێوی کردووم.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار و فام کردنەوەم، وردەوردە هەستم بە شتەکان دەکرد، دایکم منی دەکردە کۆڵ و، ڕۆژانە ماڵانی خاوێن دەکردەوە.

بەڵام بەداخەوە باوکم هەر لەو ڕۆژگارەدا تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو و، کۆچی دوایی کرد.

من و دایکم تەنها یادگار و پاشماوەی ئەو ڕابردووە پڕ ئەوینە بووین، بەڕاستی ژیانمان بەتەواوی شێوا.

دایکم منی دەگووشی بە سینەیەوە و، بەدەم لێزمەی فرمێسکەکانییەوە دەیوت:

– ڕۆڵەکەم، باوکیشت ڕۆیشت.. باشە دوو غەریب و دەربەدەر لێرە چی بکەین؟

منداڵێتی من و، مەرجە سەختەکانی ژیان و، تەندروستی خۆی بووبوونە بارێکی سەخت بە کۆڵی دایکمەوە.

بێوەژنێکی بێ کەس بە منداڵێکەوە و، بێ پارە لە شارێکی وا گەورەدا، کە جمەی دێت لە مەترسی، ئەمانە دایکمیان ناچار کرد، لەپێناو پارێزگاریکردن لە من و ڕووبەڕووبوونەوەی سەختیی و نشێوییەکانی ژیان، بە یەکێك لە خوازبێنیکارە بەساڵاچووەکانی قایل بێت.

تەنها بۆ دەستەبەرکردنی داهاتووی من و، دابینکردنی پێویستیی ژنێکی سەربەرزانە، گەنجی و جوانی خۆی کردە قوربانیی و، لەگەڵ بازرگانێکی بەساڵاچوودا هاوسەرگیری کرد، کە ناوی (ساڵح) ئەفەندی بوو.

ساڵح ئەفەندی بازرگان، پیاوێکی باش و دڵپاك و یارمەتیدەری هەژاران بوو، کە لە پاش مەرگی هاوسەرەکەیەوە بەدوای هاوسەرێکی ژیر و سەلاردا دەگەڕا.

کاتێك دایکمی بینی بوو، وتبووی: "بەڵێ، ئەمە ئەو ژنەیە کە بەدوایدا دەگەڕێم. هەموو تایبەتمەندییەکی باشی تیایە، دیندار و، تەندروست و، بەڕەوشتە و، هەست بە بەرپرسیارێتی دەکات".

من تەمەنم چوار ساڵان بووبوو، کە دایکم و ساڵح ئەفەندی هاوسەرگیریان کردبوو.

دایکم بەهۆی ئەو ئەزموونەی لە ژینی دەربەدەری و کولەمەرگییدا بەدەستی هێنابوو، پێش هاوسەرگیریی سێ مەرجی دانابوو:

* با لەگەڵ منداڵەکانتدا نەژین و، خانوویەکی سەربەخۆمان بۆ بگرە.

* هەندێك پارە لە بانق بۆ خوێندنی کوڕەکەم بخەوێنە.

* ڕێم بە هەموو ساڵێك بچم بۆ عومرە و، سەردانی گۆڕی باوکم بکەم.

کاك ساڵحیش بەم مەرجانە قایل بووبوو و، خانوویەکی خۆشی بۆ کڕیبووین و، بە کەلوپەلی قەشەنگ و گرانبەها ڕازاندبوویەوە.

لە بانق پارەیەکی باشی بۆ خەرجیی خوێندنەکەی من خەواندبوو، تەنانەت تاپۆی چەندین پارچە زەوی و دوکان و کارگەکەیشی کردبوو بە ناومەوە، ئەمانەش لە ژێر سەرپەرشتی دایکمدا دەبوون تا خۆم دەبوومە هەژدە ساڵ.

هێندە بە ئاسوودەیی و بەختەوەری دەژیاین، هەرگیز بە خەیاڵماندا نەدەهات ئەم هەموو خۆشییە لە نیوەی ڕێدا بەجێمان بهێڵێت.

کاک ساڵح هەموو ساڵێك دایکمی دەنارد بۆ مەککەی پیرۆز، دووجاریش خۆی لەگەڵیدا چووبوو.

هەرکەسیش دەیپرسی: "لەبەرچی ئەم هەموو خەرجییە بۆ بێوەژنێك و منداڵی پیاوێکی تر دەکات؟"، لەوەڵامدا هەمیشە دەیوت:

– با ئەمە نهێنییەك بێت لای خۆم.

تەنانەت من و دایکیشم هیچ لە هۆکاری ئەم بەخشندەییەی تێنەدەگەیشتین.

لەو ساڵەدا کە چوومە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی، ڕۆژێك لەکاتی گەڕانم بەشوێن پەڕەیەکدا لەناو شتەکانی ساڵح ئەفەندیدا، چاوم کەوتە سەر پەڕتووکی یادەوەرییەکانی، منیش زۆر بە تاسەوە بووم هۆکاری بەخشندەیی بزانم، بۆیە چاوێکم پێیدا خشاند.

کاک ساڵح نووسیبووی:

"دیلان خان، من ئێوەم بە ڕێکەوت نەناسی و، نیازی دووبارە هاوسەرگیریشم نەبوو، بەڵام ئێوە ئەمانەتێك بوون لە ئەستۆم، پاش کۆچی دوایی هاوسەرەکەم، خەونێکم بینی، زاتێکی موبارەك بەو کارە ڕای سپاردم. منیش ئێوەم دۆزیەوە و، تەنها مارەم کردیت، خوا شاهیدە و خۆیشت دەزانیت دەستم لێ نەداویت؛ چونکە تۆ ئەمانەتیت لام. توخوا لە دوعاکانتدا ساڵحی گوناهکارت بیرنەچێت".

بەڕاستی من و دایکم بەم بابەتە زۆر سەرسام بووین، بەتایبەت

من، دۆش دامابووم.. کەواتە کاك ساڵح تەنها دایکمی مارە کردووە و، لێیَ نزیك نەبووەتەوە؟ دیارە ویستوویەتی دایکم بەردەوام لەگەڵ تاکەئەوینەکەیدا بژی.

ئەمە چ گەورەییەکە؟ چ ئیمانێکە؟ چ فەزڵێکە؟

تەنها ئەم کار و ڕەفتارە بەرز و قەشەنگانەیە کە ئەم کۆمەڵگەیەی پاراستووە.

## تاڤیکردنەوە، تاڤیکردنەوە، تاڤیکردنەوە!

پاش کۆچی دوایی کاك ساڵح، من و دایکم بە تەنها دەژیاین، دایکم بەهۆی نەخۆشیی و لاوازبوونییەوە لەماڵەوە دەمایەوە، ئاخر لەبەرئەوەی چەندین ساڵ خزمەتکار و جلشۆری ماڵان بووبوو، جەستەی شکستە بووبوو، نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد، کە دەنوشتایەوە هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد.

یەکەم ساڵی ئامادەییم، هەرزەکارێکی خوێنگەرم بووم و، خۆم لە ژینگەیەکی زۆر جیاوازدا بینیەوە، کە لێوان لێو بوو لە پەیوەندی حەرامی نێوان کچ و کوڕ و، بێ باکانە پارە خەرجکردن و، گوێ نەدان بە حەڵاڵ و حەرام و، لا نەکردنەوە لە نوێژ و عیبادەت..

لە سایەی ئەو میراتە زۆرەوە کە کاك ساڵح بۆی جێهێشتبووم، گەنجێکی خۆشخۆر و حازربەدەستم لێ دەرچووبوو، باکم لە هیچ نەبوو، ئەو کچانەیش کە چاویان لە میراتەکەم بوو، وەك پەروانە

دەوریان دابووم و، پەلکێشیان کردم بەرەو جیهانێکی ئاڵۆز.

چۆن دەبوو منێك کە هەموو ڕۆژێ قورئانم دەخوێند و، هیچ نوێژێکم نەدەفەوتا و، بەردەوام دژایەتی پەیوەندی هەڵەی نێوان کچان و کوڕانم دەکرد، لەبەردەم حەرامدا ئاوا لاوازم لێ دەربچێت؟!

دایکم کە دەیبینی ئاوا سەرگەردان بووم، زۆر خەمی دەخوارد و، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم، کە دەیشیزانی هیچ باکم لە قسەکانی نیە بە فرمێسك ڕشتنەوە دوعای بۆ دەکردم و، پێی دەوتم:

– تۆ نەوەی باپیرتیت کە ژیانی بۆ نوێژەکانی تەرخان کردبوو و، ڕۆڵەی دایکێکیت بۆ هاتنەدنیات خۆی دەربەدەر کرد، کوڕی باوکێکیت کە بێجگە لە خۆشەویستی خودا و قورئان هیچی لە دڵدا نەبوو ...

بیکە بە خاتری خوا، عومرت بەبا مەدە؟ ژیانی هەتاییت لە کیس دەچێ، گەر بەزەییت بە مندا نایەتەوە، بەزەییەکت بە خۆتا بێتەوە ...

قۆناغی خوێندنی ئامادەیی و زانکۆم، سەردەمی گرفتار بوونم بوون بە چەندین هەڵە و لاساری و لەڕێ لادانەوە... دایکە بەستەزمانەکەیشم، وەك مۆم دەسووتا و، لە فرمێسك ڕشتن زیاتر هیچ چارەیەکی شك نەدەبرد.

ئەو دوکان و بازاڕ و کارگانەم فرۆشت کە کاك ساڵح بە میرات بۆی

جێ هێشتبووم و، لە ماوەیەکی کورتدا ئیشێکی نوێم دەست پێکرد و، سەرکەوتووبووم، بوومە بەڕێوەبەری چەندین کارمەند، بەڵام کات بەفیڕۆدان و شەوبێداریی و ڕابواردنی شەوانەم لەگەڵ هاوڕێ ڕێوی ئاساکانمدا –کە باکیان بە حەڵاڵ و حەرامەوە نەبوو– بووبوونە چەقڵی ڕێی دڵپاك مانەوە و لا کردنەوە لە دین و ئیمانم.

لەسەرووی هەمووی ئەمانەوە، دڵی ئەو دایکە میهرەبان و زەحمەتکێشەم دەشکاند و، بووبوومە مایەی فرمێسك ڕشتن و شەونخونیی ئەو بۆ ڕۆڵەیەکی بێ ئەمەك و لاسار.

چەندین شەو نەدەگەڕامەوە ماڵەوە و، هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات کە دایکم خەمی منی دەبێت و، بەو نەخۆشییەیەوە لەبەردەم پەنجەرەکەدا چاوەڕێم دەکات؛ کاتێك نیوەی شەو دەگەڕامەوە، دەمبینی هێشتا نەخەوتووە.

ناشوکریی و بێ باوەڕیم کردبووە هۆکارێك بۆ ئازاردانی دڵی دایکم، بێ ئەوەی بزانم دوورکەوتنەوەم لە ڕاستییەکانی باوەڕ چ دەرەنجامێکی لێ دەکەوێتەوە.

بەکورتی بوومە نێچیری باڵشکاوی چنگی نەفس و، شەیتان و، هاوڕێ و ژینگەی خراپ!

کە تەمەنم گەیشتە نزیکی سی ساڵان، بێزار بووبووم لە ژیانی پشێو و پەرتەوازەم و، پێویست بوو هاوسەرێکی هێندە شۆخوشەنگ

بۆ خۆم بدۆزمەوە، کە لە جوانیدا بێ وێنە بێت و، هەر کەس چاوی پێ بکەوێت، بڵێت: "ئەمە ژنی ئازادە!".

کچێکی زۆر شۆخوشەنگم لە یانەیەکی شەوانەدا بینی، ئێستەش نازانم ئەوە بە ڕێکەوت بوو یا یەکتر بینینەکەمان پلان بۆداڕێژراو بوو!

تا بڵێیت باڵابەرز و، قژ کاڵ و، نازدار بوو و، بە نیگایەکی مرۆڤی مەست دەکرد...

لەناکاو دڵم کەوتە تەپە تەپ و، پێش ئەوەی بزانم کێیە و چییە، یا بۆ من دەگونجێت یان نا، سەراسیمەی بووم.

یەکترمان ناسی و، هەر زوو بووین بە هاوڕێ.

بۆئەوەی گیرۆدەی خۆیم بکات، خۆشەویستییەکی وای پیشان دەدام کە بە عەقڵی مرۆڤدا نایەت، بێگومان لە کۆتاییشدا سەرکەوتوو بوو؛ چونکە هێندە شەیدای بووبووم، کە ئەگەر داوای چاومی بکردایە بێ سێ و دوو پێشکەشم دەکرد.

## ئەوینێکی فریودەر!

دۆستە ڕاستەقینەکانم، لە خەمخۆرییانەوە بۆم ئاگاداریان کردمەوە لە داوی ئەم کچە مەکربازە. تەنانەت شتی وای لەبارەوە دەوترا، کە مرۆڤ لە ئاستیاندا دڵی تێکەڵ دێت.. بەڵام خۆ من چاوم لە ئاست ڕاستییەکاندا داخستبوو و، نەمدەویست باوەڕ بکەم.

لە کۆتاییدا دەموت: "ئیرەییم پێ مەبەن!".

کاتێك بردم بۆئەوەی بە دایکمی بناسێنم، هیچ ڕێزێکی بۆ تەمەن و دایکێتی دانەنا و، بەردەوام ئەمەی دەوتەوە: "من تاقەتی پیرو پەککەوتەم نییە و، ژیانێکی سەربەخۆم دەوێت".

دڵی دایکمم بەم هاوسەرگیرییەم کردبوو بە هەزار پارچەوە، ئەو بێ چارەیەش لەبەرئەوەی چەند بارە دەمەقاڵێم لەگەڵ نەکاتەوە نارەزایی دەرنەدەبڕی، تەنها بە نیگا دایکانەکانی سکاڵای دڵی دەگەیاند، بەڵام خۆ من لام لێ نەدەکردەوە، ئەویش ئاهو ناڵە و دڵشکاویی لە سینەیدا ناشتبوو و، چارەنووسیی بە خوا سپاردبوو.

لە ڕاستیدا هێندە دڵڕەق بووبووم کە سەرەڕای ئەوەی ئاگاداری ئەو حاڵەی دایکم بووم، کەچی هەر لە سەرکەشیی خۆم بەردەوام بووم و، لەپێناو ڕەزامەندی ئەو کچەدا دایکیشم فەرامۆش کردبوو.

لە قۆناغی منداڵیمدا چەندین خەیاڵم بۆ داهاتووی خۆم لەپێناو دایکمدا کێشابوو: "دەبمە ڕۆڵەیەکی گوێڕایەڵی دایکم و، هەرگیز تەنیای ناخەم و، لە قسەی دەرناچم و، تا لە ژیاندا بم دەیکەمە تاجی سەرم.. ئاخر دایکم لەپێناو پەروەردەکردنمدا داروندار و گەنجی و جوانی و تەمەن و تەندروستی خۆی کرووەتە قوربانی، بۆیە منیش تا لە ژیاندا بم، پارێزگاری لێ دەکەم".

چیتر ئەو ئازادە دڵپاکەی ڕۆژگاری منداڵی نەبووم، بەڵکو ڕۆڵەیەکی لاسار بووم، کە بەپێچەوانەی ئەوانەوە ڕەفتارم دەکرد.

ئەو کچەی، دێوانەی بووم و، واتای ژیان و ئاواتی گەنجیم بوو، ڕۆژێك هات و ڕووی ڕاستی خۆی پیشان دام، کاتێك وتی:

– بڕوانە، ئیتر دەبێ منت ناسیبێت، گەر خۆیشت تێ نەگەیشتوویت هاوڕێکانت منیان پێ ناساندووی، گوێ بگرە با خۆشم پێت بڵێم:

من پەیوەندیم لەگەڵ کۆنە دۆستەکانمدا ناپچڕێنم، لەبەرئەوە دڵپیسی نییە.. جار جار ماڵ جێ دێڵم و جەوێك دەگۆڕم، کەواتە پرسیار کردن نییە. دین و ئیمان و ئابڕوو و ئەم شتانە لای من ناخوات... ڕازی نابم بڵێی بۆ لای کێ و بۆ کوێ دەچی.. من ژنێکی ئازادم، نامەوێت هەڕەشە و ئامۆژگاری و ئەمانەم گوێ لێ بێت!

لە ئاست ئەم قسانەدا –کە هیچ پیاوێك هەرگیز ناتوانێت قبووڵی بکات– منی فریوخواردوو وەڵامم "باشە"بوو!

لە سەرەتادا دایکم، پاشان دۆست و ناسیاوان و، چەندین خێرخوا لەو هاوسەرگیریە هەڵەیە ئاگاداریان کردمەوە و، نارازایی بوون لەسەری، بەڵام نەیانتوانی پەشیمانم بکەنەوە و، هەر چۆنێك بوو بە ئاهەنگێکی زۆر شاهانە هاوسەرگیریمان کرد.

وەك دیاری هاوسەرگیرییەکەشمان، لە گرانبەهاترین شوێنی شاردا کاروانسەرایەکم بۆ کڕی و، تاپۆکەشم کرد بە ناوییەوە. ئۆتۆمبێلێکی

ئـــاخیر مۆدێــل و، گرانبـــەهاترین کەلوپـــەلی مـــاڵ و، پێویســـتی و ناپێویستیم بۆ دابین کرد.

هەمووانم بەم دەستبڵاویی و زیادەڕەوییانە سەرسام کردبوو و، بە جۆرێك جڵەوم دابووە دەستی ئەو کە لە باسکردن نایەت! لە ڕاستیدا ئەمە تەنها گەوجی و نەفامیی پەتی بوو!

ماوەیەك پاش زەماوەندی هاوسەرگیریی ئێمە، ئـاگر لـە ماڵەکـەی دایکمدا کەوتەوە، هـەروەها بـەو پێیـەی تەندروستیشـی بـاش نـەبوو، دەمویسـت بیهێنمـە لای خۆمـان، بـەڵام کـە ئەمـەم لای ئـەو درکانـد: قیامەت لە ماڵەکەماندا هەستا و، وتی:

– من ناتوانم لەگەڵ دایکتدا لە یەك ماڵدا بژیم ...

منیش دەمویست هێوری بکەمەوە، پێم وت:

– سەیرکە، ئەو دایکی منە، ماڵەکەی سووتاوە، دەبی بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تـر، منـیش نـاتوانم خانوویـەکی بـۆ بگـرم و تـەنها جێـی بهێڵم، ئاخر ئاوا خەڵك چیم پێ دەڵێن؟

زۆر لووتبەرزانە وتی:

– جا بۆ نایبەی بـۆ خەڵوەتگـەی پـیری؟ لـەوێ هـەم بەخێویشـی دەکەن، هەم ئاگاداری نەخۆشییەکەیشی دەبن.

زۆر سەرسام بووم، سەرسـام بـوون چ وشـەیەکە ! بەتـەواوی واقـم وڕما، وتم:

– بۆ نازانیت دەبێ دایك و باوكان وەك تاجی سەرمان بن! كەسێك دەبرێتە خەڵوەتگەی پیری كە بێكەس و كەفتەكار كەوتبێت.

بە نیگایەكی دڵڕەقانە چاوی لە چاوم بڕی و وتی:

– ئێستە دەتەوێ بڵێیت چی؟

بە هێواشی وتم:

– دەمەوێ بیهێنم بۆ ئێرە، با لەگەڵ خۆمانا بژی.

دەنگی زیاتر بەرز كردەوە و قسەكانی پێ بڕیم:

– نابێت! ئێرە ماڵی منە و، تاپۆكەشی بەناوی خۆمەوەیە.. منیش ژنێكی ئازادم، قەت ماڵەكەم لەگەڵ كەسا بەش ناكەم و، ڕێ بە كەس نادەم خۆشی ژیانم لێ تێكبدات.

بە شێوازێكی لەسەرخۆ وەڵامم دەدایەوە، دەمویست هەرچۆنێك بووە ڕازی بكەم:

– وا مەكە، ئەو كەس نییە، دایكمە! منی بە هەزار دەردی سەری گەورە كردووە و، لە ماڵاندا ئیشی كردووە تا من پێ بگەیەنێت. ئێستەش پێویستی بە منە، دەتەوێ لە كۆڵان فڕێی بدەم؟

– دەزانم ئازاد، بەڵام من نامەوێ كەس لەگەڵم بژی، من كەسێكی تایبەتم. مێردەكەم و ماڵەكەم و شتەكانیشم تایبەتن و، بەس هی منن، لەوەندە زیاتر ناوێت.

پێموت:

– گیۆنول، تکایە لێم تێبگە، تۆش دایك و باوکت هەیە، ئەگەر تووشی بارێکی ئاوا بووبوونایە، من لە پێش تۆوە دەمهێنانە ئێرە، خۆ ماڵەکەمان هەشت ژووری هەیە، با یەکێکی بدەین بەو، باوەڕکە تەنانەت هەستیش ناکەیت لێرەیە، هێشتا نەهاتووە ...

بە دەنگی بەرز قسەکانی پێ بڕیم و، وتی:

– شتی وا نیە، هی تۆیە هی منە هیچ فەرق ناکات بۆ من.. هیچ کەسێکی تر نایەتە ئەم ماڵەوە و بڕایەوە.

لە یەکەم دەمەقاڵەی ژیانی هاوسەریماندا، هێندە قسەی ڕەق و بێزارکەری کرد، تەواو مەراق دایگرتم..

ئەو ڕۆژانە وەك منداڵیم دڵم بۆ دایکم دەسووتا، ئەو بەستەزمانە لە سەختترین ڕۆژەکانی ژیانماندا خۆی چارەیەکی دەدۆزییەوە و، نەیدەهێشت من هەست بە شتێك بکەم، کە منیش تووشی کێشەیەك دەبووم پشتی دەگرتم و، بەرچاوڕوونی دەدامێ و، لێ نەدەگەڕا بە تەنها هیچ ئازارێك بچێژم.

گەر بە بێتاقەتی بیبینیمایە، چەندین جار دەیوت: "دەرد و بەلات لەمن کەوێت" و ئامێزی گەرمی بۆ والا دەکردم، وەك کێوێکی پۆلایین پشتی دەگرتم و، دڵی دەدامەوە.. بەڵام من لە ڕۆژی تەنگانەدا –وەك ڕۆڵەیەکی بێ خێر– نەمدەتوانی تەنانەت پشتوپەنایشی بم.

لە یادمە لە ڕۆژگارە هەرەسەختەکانی ژیانی بێ کەسییماندا، من

نەخۆش کەوتم، ئەو دەمە زۆر نەبوو باوکم کۆچی دوایی کردبوو و، دایکم لە غەم و ئازاری تەنیایدا دەتلایەوە.

من نەخۆشییەکەم زۆری بۆ هێنابووم و، هۆشم بەخۆمەوە نەبوو.. دایکیشم لەپەرێشانیدا هۆن هۆن فرمێسکی دەڕشت و، لەخوا دەپاڕایەوە، خۆ جگە لەوە هیچی تری لەدەست نەدەهات. دڵنیابوو لەوەی مەگەر تەنها خوای گەورە دەروویەکی لێ بکاتەوە.

تا بەیانی لەژوور سەرم ئێشکی گرت، بەردەوام فرمێسکی دەڕشت و دەیوت:

– دایکت بەقوربانت بێت. دەرد و بەڵات لەمن کەوێت، ئاخر ئەگەر تەنیام بخەیت، من چیبکەم؟ دایکت بەقوربانت بێت، چاوەکانت بکەرەوە.. هیچ شتێکم لە دەست نایەت.

ئای! چ دیمەنێك بووە، بێ پارە، بێ کەس، تەنیا باڵ بووە و، کەسێکی شك نەبردووە هانای بۆ بەرێت، خەریك بوو لەو شارە بێ ویژدانەدا بە هێواشی و بە بێ دەنگی گیان لەدەست بدەم!

دەستی بەرز دەکردەوە و، بەدڵ دوعای دەکرد:

– خوایە گیان! هەر خۆت چارەی بێ چارەکانیت، کەسی بێ کەسانیت، شفادەری نەخۆشییەکانیت، ئومێدی بێچارەکانیت. ڕەحممان پێ بکە، منداڵەکەم بەرگەی ئەم ئازارە ناگرێت، ئاخوداخی ئەو بکە نسیبی من.

دایکە فیداکارەکەم! میهرەبان، دایکە ڕەنجکێشەکەم! دایکە نازدارەکەم، ئامادەبوویت لە پێناو ڕۆڵەکەتدا هەزار جار بمریت، کەچی ئێستە کوڕەکەت ئاوا پاداشتت دەداتەوە!

تۆ لەپێناو سەلامەتی منداڵەکەت ئامادە بوویت بمریت، کەچی منداڵەکەت ئامادە نییە بتباتە ماڵەکەی!

چۆن بتوانم لەیادی بکەم، کە سەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە لە نەخۆشخانەکەدا دەیقیژاند؟

منی کردبووە باوەشی و تکای لە پەرستار و پزیشکەکاندا دەکرد:

- بەقوربانتان بم یارمەتیم بدەن، منداڵەکەم خەریکە دەمرێت. توخوا فریای کەون؟ با هیچ لە ئازادەکەم نەیەت، ڕزگاری کەن.

پزیشکەکانی بەشی فریاکەوتنی خێرای نەخۆشخانەکە دەیانویست دایکم هێور بکەنەوە، بەڵام ئەو هەر دەینرکاند و دەیوت: "ئازادەکەم، ئازادەکەم .."

دایکێك کە دونیای هێنابوویە سەیری تا فریای کوڕەکەی بکەون، من ئێستا ئامادە نیم لە کاروانسەراکەمدا ژوورێکی بدەمێ تێیدا بژی!

**خانووەکەمان گەورە و فراوان و، دڵمان تەسك و تار بوو!**

نرکە و ناڵەی دەروون و، سەرکۆنەی ویژدان تاسەر ئێسقان ئازاریان دەدام.

ئەوە یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا کە هەست بکەم هەڵەیەکی زۆر

گەورەم کردووە، بەڵام هێندە بوێرییم شك نەدەبرد ڕووبەڕووی (گیۆنول) ببمەوە، کە بە ڕووخساری چەواشەی کردبووم.

پێشینان بە کەسی وەك منیان وتووە: "تاقەنەی بێ بەرەکەتە".

دەڵێن: "بە قسەی خۆش مار لە کون دێتە دەرەوە"، بۆیە دەستی هاوسەرەکەم گرت و، بەشێوەیەکی نەرمونیان و شیرین وتم:

– گیانی من، کەواتە با شتێکی تر بکەین، تکایە قسەکەم پێ مەبڕە و، گوێم لێ بگرە.

– بڵێ بزانم، قسەکانیشت زۆر درێژەیان کێشا.

– دوا قسەم دەکەم و، شەرت بێ جارێکی تر ئەم بابەتە نەکەمەوە.

بەتووڕەیی سەیری ڕووخساری کردم و، وتی:

–چی دەڵێیت بیڵێ، دیارە ئەم هەویرە زۆر ئاو دەکێشێ.

کە سەرم بەرز کردەوە، بە تیری نیگا ساردوسڕەکانی دڵمی داخورپاند، هەرچۆنێك بوو وتم:

– با قاتی ژێر زەمین بدەین بە دایکم، لەپشتەوەی ڤێللاکەش دەرگایەکی بۆ دەکەین. خۆم پەرستارێکیشی بۆ دەگرم. ئەوکاتە نایبینیت، تەنانەت هەست بە بوونیشی ناکەیت، با خەمیم نەبێت.

بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین دەستی بەرزکردەوە و، بە هەموو هێزی کێشای بە مێزەکەدا:

– نابێ ئەم ژنە پێ بخاتە ئەم ماڵەی منەوە، کە ئەوەندە بیری دەکەیت، تۆ بچۆ لای ئەو بژی.

بۆ تێناگەیت؟ چارەیم ناوێت، نامەوێت ئەو ژنە لادێیە لەم ماڵەدا بێت، چاوم بە بینینی هەڵنایەت.. بەو لەچکە ڕەشەیەوە دایمە دەڵێی کۆستی کەوتووە، خۆ سەر لە سوجدە بەرز ناکاتەوە..

ئەم قسانەی وەك تاشەبەرد بەسەرمدا باراند، نەك وەك هاوسەر بگرە وەك مرۆڤێکیش هەستەکانمی ڕانەگرت و، بەردەوام بوو:

– بەکورتی یان ئەو ژنە یان من.. ئیتر ئێستا بڕیاری خۆت بدە.

لەوکاتەدا بەتەواوی دۆش دامام، هەستم کرد زەمەن وەستاوە، تا سەر ئێسقان هەستم بە شەرمەزاری و کاڵفامی و نەفامی دەکرد.

ڕووداوەکانی ژیانم و، ڕەنجکێشانی دایکم وەك فیلمێك هاتەوە بەرچاو و، ئامۆژگاری و تکاکانی هاوڕێ باشەکانم کەوتەوە یاد. کە دەیانوت:

– بە جوانی ئەو کچە هەڵمەخەڵەتێ! تۆ نازانیت چەند ماڵ و گیانی کاول کردووە.

– کەس نازانێت لەگەڵ چەند پیاودا پەیوەندی هەبووە.

– ئەوەی خوا و بیروباوەڕ بێت ئیمانی پێی نییە، ڕەوشت و دابونەریت لای بێ بایەخن.

- ئەگەر دەتەوێ ئابڕووت بپارێزیت، ئەوا ئەم کچە بۆ تۆ شیاو نییە.

کەواتە قسەکانیان هەمووی ڕاست دەرچوو؟ بە جوانی و مەکربازیی ئالوودەی خۆی کردووم؟ ئەوەتا وەك خزمەتکارێك حسابم بۆ دەکات.

کاتێك هێواش هێواش لە ڕاستی مەسەلەکان حاڵی دەبووم، کات زۆر درەنگ بووبوو و کار لە کار ترازا بوو.

دایکێك کە بەهەزار دەردی سەری گۆشی کردبووم، ئامادە نەبووم لە ژێرزەمینی کاروانسەراکەیشمدا داڵدەی بدەم!

ئەو ئازادە بەو شانوشکۆیەی کە کرێکار و ژێردەستەکانی بە فەرمانی ئەم هەڵدەستن و دادەنیشن و، سەرۆکی کۆمپانیایەکی بەناووناوبانگە؛ ئێستە لەبەردەم ژنەکەیدا زاری بۆ هەڵنایەتەوە و، لا لە دایکە فریشتە و ڕەنجەڕۆکەی ناکاتەوە.

## دڵ بریندارکردنی (دایك)یش بەم شێوەیە!

ئەو شەوە تا بەیانی خەو لە چاوم نەکەوت، هەر دەر و ژوورم بوو، لە سەربانەوە بۆ ژوورەوە، لەوێوە بۆ باڵکۆن...

زۆر پێویست بوو زوو بڕیارم بدایە و، دایکم لە شوێنێکدا نیشتەجێ بکردایە، بەڵام کوێ؟ چەند جێی داخە لە چەقی ئەم شارە گەورەیەدا من (ئازاد)ی بازرگان، بەدوای شوێنێکدا دەگەڕام بۆ دایکم.

(گیۆنول) له سەنگەری دۆڕاندا زیندانی کردبووم، تا دەهات لە مرۆڤبوونیشم دادەماڵرام.. واتە بوویەکی نەبوو بووم، وەك ئەوەی لە کەناری دەریادا تینوو بیت..

لەو نیوەی شەوەدا بیری ئایەتێکم کەوتەوە کە تەنها پاشماوەی ئەو ڕۆژگارە بوون کە هێشتا بیروباوەڕم بەبا نەدابوو و، بە خەیاڵی منداڵانەوە خۆم سەرقاڵ نەکردبوو و، پشتم لە پەیامی خوایی نەکردبوو.

﴿وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً﴾ الإسراء: ٢٣، واتە: (خودای پەروەردگارت فەرمانی داوە هەر ئەو بپەرستن و، عیبادەت بۆ کەس مەکەن بۆ ئەو نەبێت. هەروەها فەرمانی داوە لەگەڵ باوك و دایکدا ڕەفتارتان چاك بێت، ئەگەر یەکێکیان لای تۆ بوو و لە سایەی تۆدا پیربوو، یا هەردووکیان لای تۆ بوون و لای تۆ پیر بوون، هەرگیز ئۆف مەکە لە دەستیان تا دڵیان نەیێشێت و هەرگیز لێیان تووڕەمەبە و بەڕوویاندا هەڵمەشاخێ و قسەی نەرم و نیان و باشیان لەگەڵ بکە).

زۆر لە خۆم تووڕە بووم، لەبەر خۆمەوە دەموت:

– هێی ئازاد! ئەی تۆ؟

لە بارێکی زۆر سەختتدا بووم.. بەدرێژایی شەو بیرم لەوە

دەکردەوە چی بکەم. بێگومان گیۆنول هیچی بەلاوە گرنگ نەبوو و، لەگەڵ دۆستە کۆنەکانیدا وەك هەرزەکار سەرقاڵی بەزم و بالۆرەی خۆیان بوون.

بە بیروڕای ئەو: ئەمە پێشکەوتنە، ئازادیە، مافە.. کەچی منیش هێندەی دابینکردنی شوێنێکی نیشتەجێبوونی سادەش مافم نەدەدا بە دایکم.

ئەو شەوە گیۆنول، تا دەمەو بەیانی لەگەڵ هاوڕێکانی سەرقاڵی کەیفوسەفای خۆی بوو..

واتە من هێندە کاڵفام و ساویلکە بووم کە ئاشقی ژنێکی ئاوا بوو بووم!

بەیانی زوو پێش هەموو شتێك تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و پەیوەندیم کرد بە هاوڕێیەکمەوە لە نەخۆشخانە، کە پسپۆڕی (نەخۆشیەکانی هەناو) بوو و، وتم:

– لە بارێکی زۆر قورسام، تکایە هاوکاریم بکە.

بە شێوازێکی گاڵتەئامێزانە وتی:

– کاکە ئازاد، تۆ بەس فەرمان بکە، با ئێمە لە خزمەتتا بین.

– بێ چۆن و بۆچی، دایکم لە بەشی فریاکەوتنی خێرا تۆمار بکە، واتە لە نەخۆشخانە بیخەوێنە.. باکت بە پارە و شت نەبێ، پێویستی بە چی بوو بیکە و، تا بتوانیت دایکم لە نەخۆشخانە بهێڵەوە..

دەمەوێت خەڵك وا بزانن دایکمم ناردووە بۆ چارەسەر.

پزیشکەکە زۆر سەرسام بووبوو و، وتی:

– چۆن؟ یەعنی دایکت نەخۆشیش نییە، بەڵام لەبەر دڵی تۆ وەك نەخۆش لە نەخۆشخانە بیهێڵمەوە؟

– ئا ئا..

– سەیرکە کاکە، ئێمە چەند دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بین ناتوانین لە بابەتی (دایك)ا شتی وا بکەین.. نامەوێت تووشی دەردی سەری ببم.

– تۆ تەنها پارەکەت وەردەگریت. هەموو بەرپرسیاریەتییەکان لەسەر من.

دووبارە:

– ئازاد ... هەرچەندە من ئەوەندە باوەڕداریش نیم، بەڵام لە ئەزموونەکانمەوە دڵنیا بووم: کەسێك دایکی ئازار دابێت، یان دایکی دوعای خراپی لێ کردبێت، هەرگیز سەرکەوتوو نەبووە! من لەم نەخۆشخانەیەدا چەندین جار بەسەرهاتی ئاوام بە چاوی خۆم بینیوە.

هەر چۆنێك بوو ئەوەندە لێی پاڕامەوە، تا ڕازی بوو. لە کۆتاییدا وتی:

– کاکە، دوایی نەڵێی پێی نەوتم، من ئەمەت بۆ دەکەم، پارەی خۆشم وەرەگرم، بەڵام دڵنیابە ئەمە پەشیمانی و ئازاری زۆری

بەدواوە دەبێت، بەڵام لە کاتێکدا کە کار لە کار ترازاوە.

ئەم وتانەی زۆر ئازاری ویژدانیان دام..

لە ڕاستیدا قسەکانی زۆر ڕاست بوون و، کاتێک هەستم بەم ڕاستییانە کرد، زۆر درەنگ بووبوو.

کاتێك چووم بەدوای دایکمدا، بۆئەوەی بیبەم بۆ نەخۆشخانە، لە ماڵی دراوسێیەکی بوو و، هەر کە چاوی بە من کەوت، لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، بە تەواوی دەموچاوی گەشایەوە و وتی:

– بەقوربانت بم ئازادەکەم، وەرە با تۆزێك بۆنت بکەم.

ئاخ! دایە گیان.. توند بە سینەیەوە گوشیم. بۆنی میهرەبانی و سۆزی دایکایەتی تا سەر ئێسقان کاری تێ کردم..

لە دڵی خۆمدا وتم:

– هێی ئازاد! هەزار گیۆنول هێندەی باوەشی گەرم و بەسۆزی دایکت ئاسوودەت دەکەن؟!

ڕاستیان وتووە: "دایکان بێ چاوەڕوانی هیچ جۆرە قەرەبوویەك و بێ بەرانبەر ڕۆڵەکانیان خۆش دەوێت، لەبەرئەوە هیچ خۆشەویستییەك ناگات بە خۆشەویستی دایك!"

بەڵێ، ئەوەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە.

خێزانەکەی دراوسێی دایکم زۆر بە گەرمی میوانداریان کردم، تەنها لەبەر دایکم وەك پەروانە دەوریان دابووم.

کەواتە شتێك هەیە بە ناوی (لەبەر خودا خۆشویستن!)؟

دایکە ستەمدیدەکەم! لای هەمووان گەوهـەر بوویت، بـەڵام تـەنها من نرخی تۆم نەزانی.

کاتێـك لەگـەڵ دایکـم لـە مـاڵی دراوسـێکەی دەهاتینـە دەرەوە، خانمی دراوسێ وتی:

– کاکە ئازاد، ئەگەر پوورە دیلان دەبەن بۆ شوێنێك کە لێی بێزار دەبێت، باوەڕ بکە بـۆ ئێمـە هـیچ ئـەرکێکی نییـە، لێ گـەڕێن بـا لێـرە بمێنێتەوە. منداڵەکانیش زۆریان خۆش دەوێت و، بە ئامۆژگاری و وتە شیرینەکانی مەست بوون.

دوو کچەکەم بەهۆی ئامۆژگارییەکانییەوە سەرپۆشیان کـردووە و، دەستیان کردووە بە نوێژ کردن، تەنانەت کوڕەکەشم دەستی کـردووە بە قورئان خوێندن.

لەوانەیـە بـاوەڕ نەکـەن، بـەڵام ئـەوە دوو ڕۆژە ماڵمـان بووەتـە بەهەشت، دوێنێ ئێوارەش کە مێردەکەم هاتەوە، وتی:

– نهێنییەك لە کارەکانما دەبینم، کە ناتوانم لێی تێبگەم.

– بۆچی، چی بووە؟

– هەموو کارەکانم، هەموو کێشـەکانم خـەریکن چارەسـەر دەبن، قـەرزی چـەند سـاڵ لەمـەو پێشیشـم بەشـێوەیەك دایـەوە بـە خـاوەن قـەرزەکان، کـە بـاوەڕ ناکـەیت.. بیسـت ساڵیشـە ئەوەنـدە مشـتەریم

نەبووە و، ئیشم نەکردووە، دەبێ چیمان کردبێ، وا خوای گەورە دەرگای بەزەیی و ڕزقی لێ کردووینەتەوە؟
کاک ئازاد، دایکتان بەرەکەتی خستووەتە ماڵەکەمانەوە، ناکرێ نەیبەن؟

## لە غەزەبی خودا بترسە:

وتەکانی خانمی دراوسێ وەك بەرد بەسەرمدا دەبارین، مەگەر من کوڕی کێم و هەستم پێ نەکردووە! ئەم ماڵە بێ ئەوەی خزم و کەسمان بن، وەك گەوهەر لە دایکم دەڕوانن و، لەسەر سەر دایدەنێن، کەچی من نەمدەزانی چۆن لەکۆڵ خۆمی بکەمەوە.
لەناکاو ئەو قسەی دایکم بیر کەوتەوە کە گەر هەڵەیەکم بکردایە پێی دەوتم: "خوا ئەمە قبوڵ ناکات کوڕەکەم، ڕۆڵە، لە خودا بترسە".. بە بیروخەیاڵێکی ئاڵۆزاو و پەرش و بڵاوەوە دایکم برد و، بەرەو نەخۆشخانە کەوتینەڕێ، بێ ئەوەی نەخۆشی گورچیلەی هەبێت، دەمبرد بۆ ئەوەی لە بەشی نەخۆشییەکانی گورچیلە بیخەوێنن.
کە گەیشتینە بەردەم نەخۆشخانە، دایکم بە مەراقەوە وتی:
– ڕۆڵە گیان خێرە، بوکەکەم نەخۆشە یان چی؟
ئەم دایکەم چەند بەستەزمان و دڵپاك بوو، خەمی تەندروستی کەسێك دەخوات، کە تەنانەت ڕێز بۆ مرۆڤ بوونی خۆیشی دانانێت و،

به هیچ شێوەیەك تەمەن و هەستی دایكم لەبەرچاو ناگرێت، دیارە ئەمە جیاوازی دایكە.

به حەسرەتەوە وتم:

– نا دایە، هیچ شتێك نەبووە.

– كەوایە، ڕۆڵەكەم بۆ هاتووین بۆ ئێرە؟

– دایكە خۆم پێم وتوون چاودێریت بكەن و، لە سەر تا پێ پشكنینێكی گشتیت بۆ بكەن.

– ڕۆڵە بۆ خۆت دەخەیتە زەحمەتەوە؟ بەو هەموو سەرقاڵییەتەوە منت هێناوە بۆ ئێرە؟ من شوكر بۆ خوا دەتوانم چاودێری خۆم بكەم.

ئاخ دایكە! ئاخ!

ئەمە هەڵوێستی ئەو بوو.. لە ژیانمدا نەمدیوە گلەیی لە بەختی خۆی بكات و، بەهۆی نەخۆشییەكەوە ناشوكری بكات. هەموو كات دەیوت: "زۆر شوكر و سوپاس بۆ خوا، كەسی زۆر لە منیش نەخۆش و دەردەدارتر هەیە، هەرچی لای خواوە بێت، پێی شوكرین" و، هەردەم پشتی بە خودا دەبەست.

دایكە بەوەفاكەم برد بۆ نەخۆشخانە و، لە بەشی (نەخۆشییەكانی گورچیلە) ژوورێكی تایبەتم بۆ گرت و، خەواندم.

وردەوردە دایكم گومانی بۆ دروست بوو و، وتی:

– ڕۆڵەگیان، خۆ گورچیلەکانم هیچ عەیبێکیان نیە، بۆچی منت هێناوە بۆ ئێرە؟

لەو کاتەدا کارە نامرۆڤانەکەم گەرووی گرت، زارم بەسترا.. نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە. ئاخر دایکم، کەسێکی دنیادیدە و، تێگەیشتوو و، دڵ پاك بوو، هەر زوو لە بابەتەکان حاڵی دەبوو.

چەند ساتێك تارماییەکانی نائومێدی ڕووخساریان تەنی و، بە چاوە پڕ سۆزەکانی ماوەیەك لێم ڕاما، هەر نیگایەکی وەك تیر نیشانەی لە دڵم دەگرتەوە، وەك ئەوەی گوللەم پێوە بنێت، چونکە دایکم هیچ کات بەرپرسیارییەتی کێشەکانی نەدەخستە ملی من.

لەناکاو باوەشی پێداکردم وەك ئەوەی جارێکی تر نەمبینێتەوە و، وتی:

– باوانەکەم، خۆم باش دەزانم من گورچیلەم نەخۆش نییە و، بۆچی هێنراومەتە ئێرە.. من گەردنت ئازاد دەکەم، بەس خوا لێت خۆش نابێت.. منیش بەرگەی ئەمە بگرم، خۆ خوا ئەم ناهەقیە قبووڵ ناکات، نەتبیستووە ئەوانەی دەست بەڕووی دایکیانەوە دەنێن، خواش ڕووزەردیان دەکا؟

تاقانەکەم، خۆ دووربێ بەڵایەکت بەسەر بێت، من بەرگە ناگرم. وەرە، توخوا لێرە بە تەنها جێم مەهێڵە. دەنا بەر غەزەبی خوا دەکەویت و، خێر لەخۆت نابینی..

دڵنیا بووم وشەکانی دایکم هەموویان ڕاستن و، دەیەوێت ڕزگارم بکات لە چنگی نەفامیم، بەڵام هیچم پێ نەوترا، هەستامە سەر پێ و بەرەو دەرگاکە ڕۆیشتم.

وەك ئەوەی لە ژوورێکی ئوتێلێکدا جێم هێشتبێت، پێم وت:

– لێرە چیت بوێت بۆت دەکەن، خۆیشم چەندێکم توانی سەردانت دەکەم.

ئەی هاوار! تۆ چ ڕۆڵەیەکیت بۆ دایکێکی فریشتەئاسا و بێ کەسی ئاوا؟

ڕۆژێك یەکێك لە دۆستە دڵسۆزەکانم پێی وتم:

– گەر لەم ژنەت جیا نەبیتەوە، دنیا و ئاخیرەتیشت بە بادا دەدات.

بەڵام بێگومان من زۆر بە تووڕەیی بەرەنگاری بوومەوە.

جیابوونەوە؟ نەخێر! تەنانەت وتنیشی ئازاری دەدام، سەرەڕای هەموو لەکە و کەموکورتییەکانی جیابوونەوەم لا مەحاڵ بوو و، بەرگەی نەبوونی ئەوم نەدەگرت.

ئەو وەك جادووگەرێك چاوبەستی لێ کردبووم، چونکە بێ وچان خواست و فەرمانەکانیم بۆ جێ بە جێ دەکرد..

## ئەو مەرگەساتەی نزیك دەبووەوە:

چوومەوەماڵەوە و، بە بێزاری و هەراسانی خۆم دا بەسەر جێگەی

خەوەکەمدا، ویستم لە چنگی بیرکردنەوەکانم هەڵبێم.

لەو ژوورەدا کە بۆن و بەرامەی عەترە گرانبەهاکان دەستلەملان بووبوون.. ترووسکەی ئومێدێکم بۆ ژیانم بەدیی نەدەکرد.

کە ڕادەکشام هەستم دەکرد دەخنکێم، بۆیە هەستام چوومە ژووری کارکردنەکەمەوە و، چاوێکم بە ڕۆژنامەکاندا خشاند.

لە یەکەمین پەڕەی ڕۆژنامەیەکیاندا مانشێتێك سەرنجی ڕاکێشام، کە دەتوت بۆ من ئامادەکراوە!

"ئەو ڕۆڵەیەی سوکایەتی بە دایکی کرد، لە ماوەیەکی کەمدا مایەپووچ بوو و، خۆی کوشت، لەو پارچە کاغەزەشدا کە دوای خۆی بەجێی هێشتووە نوسیویەتی: "ئەوەی دایکی لە دەست دەدات، چی دەباتەوە؟"

ئەم هەواڵە وەك فیشەکێك مێشکمی پێکا و، هیچ توانام نەما وردەکاریی هەواڵەکە بخوێنمەوە.

سەرم خستە سەر مێزەکەم و، پاش چەندین ساڵ سەرکەشی بۆ یەکەمجار بە شەرمەوە وتم "خودایە! ژیانم پڕ لە لادان و گوناهە ...." لەناکاو لە خۆم تووڕەبووم:

"کاتی بێتاقەتی بیری خوات دەکەوێتەوە وانیە؟ کە دڵیشت خۆش دەبێ ناوی خوات هەر لەبیر نامێنێ..."

ئەی خودایە! بەداخەوە شەرمم دەکرد هانا بۆ خوداش بەرم..

بەتەواوی دەستوپێ سپی بووبووم و، نەفامانە خۆم دابووە دەست ژیانێکی بەڕواڵەت ڕازێنراوەوە و، بە باقوبریق فریوم خواردبوو.

لە کەینوبەینی بیرە ئاڵۆزەکانمدا (گیۆنول) بە ناز و عیشوە و زەردەخەنە فریودەرەکەیەوە خۆی کرد بە ژووردا ...

بۆ گەیشتن بەو خەیاڵەی کە لە مێشکیدا بوو کاریگەرترین شێوازی ژنانەی خۆی بەکارهێنا و، وتی:

– لەگەڵ هاوڕێکانمدا گەشتێکی دە ڕۆژیمان ڕێکخستووە بۆ (ئەنتاڵیا).

واتە تەنانەت پرسی پێ نەدەکردم، بەڵکو تەنها پێی دەوتم "با تۆش بزانیت"، منیش لەو کاتەدا هێندە بوێرییم شك نەبرد بپرسم: "لەگەڵ کێدا دەڕۆی؟" و، هیچم نەوت، چونکە دڵنیا بووم وەڵامەکەی هیچ لە جێی خۆیدا نابێت و، هەمان قەوانی جارانم بۆ دووبارە دەکاتەوە، تەنها وتم:

– منیش؟

– نەخێر، ئەمجارە هەر خۆم و هاوڕێکانمین ..

مەحاڵ بوو ڕێی نەدەم، نەمدەتوانی بەڕوویدا بڵێم "نەخێر"!

ئەو بە ڕووکەش هاوسەرم بوو و، ناو و نازناوی منی هەڵگرتبوو...

بەڵام لە ڕاستیدا مارێکی بە خرتوخاڵ بوو و، سەرچاوەیەك بوو بۆ قسەوقسەڵۆکی خەڵکی و، هێندە لێزان بوو کە هەر جارەو بە فێڵێك یا

قسەیەکی خۆش چاوبەستی لێ دەکردم..

وتی:

– کاتی گەشتەکەم زۆری نەماوە، زووکە بمگەیەنە فڕۆکەخانە.

بەخێرایی چووینە ئۆتۆمبێلەکەوە... بێگومان بە کەشخەترین ئۆتۆمبێلەوە شۆفێریم بۆ ژنەکەم دەکرد!

نەمدەتوانی بۆ یەك ساتیش دایکم لە بیر خۆم بەرمەوە و، هەر لەپێش چاوم بوو.

هزروبیرم بەتەواوی جەنجاڵ بوو بوو، دڵم داخورپابوو، هەستم دەکرد بەلایەك خۆی بۆ حەشارداوم و، دەرکەوتنی درەنگ و زوو کەوتووە.

## تابلۆی چارەنووسێکی پڕ پەند:

لەناکاو هەستم کرد چەقۆیەکیان داوە لە سینەم! ئازارێکی کوشندە هەموو جەستەمی داگرت. هەرچۆنێك بوو ئۆتۆمبێلەکەم ڕاگرت و، لە بارێکدا کە هەستم دەکرد سەرەمەرگمە وتم:

– خەریکە دەمرم، تەلەفۆن بۆ فریاکەوتن بکە!

هەستم دەکرد چەند دڕکێك لە دڵم چەقیون و خەریکە پارچە پارچەی دەکەن ... بەرچاوم تاریك داهات و، لەهۆش خۆم چووم.

ئیتر نازانم پاش ئەوە چی ڕووی دا..

خودایە! کە هاتمەوە سەر خۆم، لەو نەخۆشخانەیەدا چاوم

هەڵهێنا کە دایکمم تێدا جێ هێشتبوو، ئەمە چ زللەیەکی میهرەبانیی بوو لە خوای گەورەوە !

پزیشکەکە هەناسەکی هەڵکێشا و هەواڵێکی زۆر سەختی پێ دام:

– بەداخەوە، بەپێی پشکنینەکان دەرکەوتووە کە گورچیلەکانت لەکار کەوتوون.

ئامان خودایە ! ئا لەو ساتەدا بەتەواوی دۆش دامام، کۆشکی ژیان و خۆزگە و خەیاڵەکانم دارِما.. ماڵەکەم، سامانەکەم، ناووناوبانگەکەم و لە هەموویان گرنگتر (گیۆنول) بوونە سەرابێك و لەپێش چاوم ون بوون.

نەمتوانی بپرسم "چۆن ڕوویداوە ؟"، لە ڕاستیدا چیتر گرنگیش نەبوو بزانم چۆن ڕوویداوە، چونکە هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرابوو.

مەگەر هەر خۆم دایکمم لەم بەشەی نەخۆشخانەکەدا جێ نەهێشت؟ بۆ ئەوەی نەخۆشییەکی لەو جۆرەی هەبێت، تەنها لەبەر ئەوەی لە کاروانسەراکەمدا سووچێکی نەدەمێ و، دڵی ژنەکەم زیز نەکەم!

لە ڕاستیدا ئەمە گونجاوترین دادپەروەری خوایی بوو بۆ ئەو ڕۆڵەیەی دایکی ڕەنجاندبوو.

دەڵێن چی بچێنیت ئەوە دەدووریتەوە، ئەوەتا خۆیشم لەو تاڵاوە دەچێژم کە بەدەستی خۆم بە دایکمم نۆشی، تا ببمە پەند و عیبرەتی

سەرزاری خەڵکی.

کاتێك بردیانم بۆ بەشی (نەخۆشییەکانی گورچیلە) و، لەسەر چەرپایەك داینانم، دایکمم بینی، کە دوێنێ بێ ویژدانانە پێم وتبوو: "نەخۆشیت" !

خودایە! بەڕاستی ئەم دیمەنە لە باسکردن نایەت!

دایکم هەر ئەوەندە چاوی بە چاوم کەوت خۆی گەیاندە لام و، لە ئامێزی گرتم و، وتی:

– بەقوربانت بم ئازادەکەم.

بەڵێ، دڵی دایك ئاوا زەریا ئاسایە! دوای ئەو هەموو سپڵەیی و بێ ویژدانی و لاسارییەی من بەرانبەری، کەچی هێشتا دڵی پێم دەسووتا.

ئەو (گیۆنول)ەیش کە لەپێناویدا چاوپۆشیم تەنانەت لە دایکی شیرین و فیداکاریشم کردبوو، دەتوت پەیکەرێکی بێ هەستە و هیچ باکی لە بارودۆخی سەختم نەبوو و، وتی "ئەم نەخۆشییە چی بوو لەم کاتەدا؟ گەشتەکەی ئەنتالیاشت لێ تێکدام"، ئا ئەمە قسەی –بەناو– تاقە یارەکەم بوو!

دایکیشم لەژوور سەرم وەستابوو و، وەك منداڵ نازی دەکێشام و، دڵنەوایی دەدامەوە و، بەدەم فرمێسك هۆنینەوەوە دەیوت:

– بەقوربانت بم ئازادەکەم. دەمزانی بەر تووڕەیی خوای گەورە دەکەویت، بەڵام نەمدەزانی هێندە زوو دەبێت.

دایکـم وەك پەروانــە بەدەورمــدا دەهــات و، تکــای لــە پزیشــك و پەرستارەکاندا دەکرد تا چارەسەرم بکەن.

بــەڵام تــازە کــار لــەکار تــرازا بــوو و، هــەردوو گورچــیلەم سســت بووبوون، لەناکاو دووچـاری خوێنبــەربوونێکی نـاوەکیش بـووم، بۆیــە دەستبەجێ بردیانم بۆ نەشتەرگەری... پێویست بوو بە زووترین کـات گورچیلەیەکم بۆ پەیدا بکرێت، دەنا دەستلەملانی مەرگ دەبووم.

بێگومــان دایکــە فریشتەئاســاکەم بــێ هــیچ بیرکردنەوەیــەك، ڕاستەوخۆ وتبووی:

– خێرا، گورچیلەی من دەربهێنن و، فریای ئازادەکەم کەون.

پزیشــکەکان لــە ماوەیــەکی کەمــدا گورچــیلەیەکی دایکمیــان بــۆ گواستبوومەوە، واتە جارێکی تریش هەر دایکە بەستەزمانەکەم گیـانی خۆی لەپێناو ڕۆڵە سپڵە و پێ نەزانەکەیدا بەخشی.

ئای دایکە گیان!

دیمەنی من و دایکم لە هەمان ژووردا هەزاران پەندی لەخۆ دەگـرت بۆ ئەوە بێ وەفاکان.

چەند ئازاربەخشە هەر کە بابەتی گورچیلە بەخشین هاتە کایـەوە، خۆشەویستترین کەسم، لەو ناوەدا دیار نەما، دیار بوو ئەو هیچ کاتێك وەك هاوسەری ڕاستەقینەی خۆی لە منی نەڕوانیبوو، بەڵام منی نەزان بە شاژنی ژیانم دەزانی، لە کاتێکدا لە مسۆگەرکردنی زیادەخەرجیی و

کەشخەیەتییەکەی زیاتر، هیچ شتێك پەیوەستی نەدەکرد بە منەوە، چونکە ئەوینی ڕاستەقینەی بۆ پارە و سامان بوو.

چەند بەئازارە، من لەبەر ژنێکی وا دایکمم پشت گوێ خستبوو! هەر بۆیە خوای گەورەش بەم شێوەیە لە دونیادا بەم سزایەی گەیاندم.

ژینێکی پڕ دەردی سەری و نەهامەتی چاوەڕێی دەکردم..

## دوایین هەناسەی پەرتکەری دڵ ...

دوو ڕۆژ پاش نەشتەرگەرییەکەم، دایکم -هەرچەندە کیسێك خوێنیان بۆ هەڵواسی بوو- هەر لەسەر چەرپاکەی نوێژی هەینی کرد. منیش بە سەرنجەوە لێم دەڕوانی، تابڵێیت بە خشوعەوە نوێژەکەی دەکرد.

دەستەکانی لەسەر سینەی بوون و، لە کەشێکی ئیمانیدا نوقووم بووبوو، بەڵام لەناکاو چاوەکانی ئەبڵەق بوون.

منیش هاوارم کرد:

- دایکە.. دایە گیان..

پەرستارەکان بە دەم هاوارەکانمەوە هاتن، بەڵام تازە بێ سوود بوو. دایکم بەرەو شوێنێکی پیرۆز گەشتی کردبوو، لە پاش خۆیشی ئەم ڕۆڵە دڵڕەقەی جێهێشت و، گەیشتەوە بە ئازیزانی.

خودایە! ئەمە چۆن گیانلەدەستدانێك بوو؟ چ دوا هەناسەیەك

بوو؟ چۆن کۆچێك بوو؟ تەنانەت پەرستارەکانیش لە ئاست ئەم دیمەنەدا فرمێسکیان دەڕشت..

بە ڕووخسارێکی نوورین و، دیدەی پڕ لە میهرییەوە، لە نوێژەکەیدا گەڕایەوە بۆ دوا مەنزلگەی.

لەکۆتایی ئەم ژینە پڕ چەرمەسەرییەدا بە خۆشەویستانی شادبوویەوە.

من نەك ڕۆڵەیەکی باش نەبووم، بەڵکو سەرەڕای دڵشکاندن و بێ نەوا کردنیشی، تەنانەت گورچیلەکانیشم لێ زەوت کردبوو... هەزار داخ بۆ ڕۆژگاری بەباچووم.

هێندە سپڵە بووم بێ گەردن ئازادی و، دەست و پێ ماچکردنی بەڕێم کرد، ئای! دایکی شیرینم ... تازە پەشیمانی چ دادێکم دەدات!



# بەشی پێنجەم



## (من)ی ڕۆڵەی لاسار
## بەرەو هەڵدێر هەنگاو دەنێم

ئەو شەوە ...

هەرگیز یەکەمین شەو پاش کۆچی دوایی دایکم لەیاد ناچێت.
هەزاران جار بەدخوویی و لاسارییەکانم هێنایەوە پێش چاوم.

ئەو شەوە ...

بەتەنها خۆم لە گێژاوی پەشیمانی و ئازاری ویژداندا، بینییەوە !

ئای! چەندە هەستم بە بێ کەسیی دەکرد.

لەو ساتانەی بێ دەنگی و خامۆشی شەودا هەڵە و تاوان و بێباکیی و گەوجییەکانم گەروویان بەستبووم.

ئەو شەوە ...

ئیتر ئازادێکی شکستە و کەفتەکار بووم.

تەنانەت ترووسکەیەکی باوەڕم لە دڵمدا شك نەدەبرد، تا لەڕووم هەڵبێت لە قاپی میهری خوای گەورە بدەم.

لەم گەردەلوولی خەیاڵەدا، خەو بردمیەوە.

لە خەونمدا لە شوێنێکدا بووم، کە لێوانلێو بوو لە کانیاوی سازگار و، داری سەوز و بەردار و، گوڵ و گوڵزاری ڕەنگاوڕەنگ...

هەستم کرد لە بە هەشتدام ... کۆشك و تەلاری هەوربڕی بە مەرمەڕ ڕووپۆشکراوی زۆر لێ بوو. بەتەواوی بە دیمەنەکە سەراسیمە بووبووم! لە دڵی خۆمدا دەموت: "دیارە ئێرە کۆشکی پێغەمبەرە (د.خ)".

لەو ناوەدا مەیدانێکی بەرفراوان دەبینرا، کە لە خەڵکدا جمەی دەهات و، ناوی خەڵکی دەخوێنرایەوە و پاداشت دەدرانەوە.

لەناکاو گوێم لە ناوی دایکم بوو، بۆیە بە پەرۆشەوە بووم بزانم چ باسە! تا پاداشت بکرێت و، بەدیداری پێغەمبەر (د.خ) شادببێت. لەو کاتەدا هەستم دەکرد لە سەرسامیمدا دەلەرزیم و، لەدوورەوە تەماشای ئەو ساحەی مەحشەرەم دەکرد. لە ئاپۆرەی خەڵکەکەدا چەند ڕووخسارێکی ناسیاوم دەهاتە پێش چاو، لەوانە: (باوکم، باپیرم، دایکم).

بەکورتی تەنها من لەو خێزانە بەختەوەر و بەهەشتییەدا جێیەکم نەبوو، هەرچەندە دەمویست بڵێم: "منیش لێرەم" بەڵام نەمدەتوانی و، دەنگم نەدەبیسترا و، گەرووم بەسترا بوو، قاچەکانم نەدەبزوان.

هەرچی هەوڵم دا، تا منیش خۆم بگەیەنمە خزمەتی پێغەمبەری

ئازیز (د.خ) و، تکای شەفاعەتی تێدا بکەم، نەمدەتوانی.

نەمدەزانی بۆچی پێکانم لەدووم نایەن، تا منیش لەو پلە و پایەیەی خێزانەکەم پشکێك دەستبخەم. لەوکاتەدا دەنگێك بە ئاوازێکی توند و فەرماناوی، کە لە هەورە تریشقە دەچوو هاتە بەرگوێم:

– مەیە، مەیە، مەیە ... تۆ شایەنی ئەم شوێنە پیرۆزە نیت.

ئەم دەنگە وەك گوللەیەك دای لە مێشکم و، لە جێی خۆم دۆش دامام. پاشان قورپیان کرد بە جەستەمدا و، منیش کەوتمە هاتوهاوار، ئەو قورە وەك کڵپەی ئاگر بەربووبووە گیانم، تەنانەت هەستم دەکرد هەناویشم بە ئاگر دەسوتێت. لە لوتکەی ئازار و سووتاندا، خەبەرم بوویەوە و، سەراپای جەستەم لە ئارەقدا گەوزا بوو..

## چ مایەپووچ بوونێك لەمە بە زیانترە؟

ئەی هاوار! ئەمە چ چارەنووسێك بوو؟ چ بارێکی ترسناك بوو؟ خۆزگە بەخەبەر نەدەهاتم! خۆزگە جارێکی تر چاوم بە دنیای ڕۆشندا هەڵ نەدەهێنا. دەبێت چ مایەپووچ بوونێك لەمە بە زیانتر و گەورەتر بێت؟ تەنانەت وەك نەوەیەکی میللەتی موحەمەدیش (د.خ) شەرەفی بینینی ڕووخساری ئەو زاتەم پێ ڕەوا نەبینرا، لە ڕاستیدا ئەمە هەزاران جار لە مردن سامناکتر بوو، تازە هەر خولەك و چرکەیەکی ژینێکی ئاوا مردنێکە بۆخۆی.

دایکە گیان، بریا گوێڕایەڵت بوومایە و، بە هاوڕێی خراپ و دۆستی نادۆست فریوم نەخواردایە..

وامدەزانی دنیا تەنیا پارە و سامان و، ناوبانگ و، ڕووکەشی دونیایە و، پشتم کردە پەیامی خوایی و، پێغەمبەر (د.خ) و، بیروباوەڕ و مرۆڤایەتی.

لە دوایین ڕۆژەکانی تەمەنتدا تەنیام خستیت و، لە لووتکەی تەنیایی و لارەملییدا دەستبەردارت بووم. تازە دەبێت دڵم بەچی خۆش بکەم؟ لاشەیەکی بێ گیان و، بێ چارەیەك و کەفتەکارێکم.

لە هەر سووچێکی تاری ژیانم دەڕوانم، شەرم دەکەم و، دڵم تێکەڵ دێت... هەزاران حەیف بۆ تەمەنی ڕابردوو و لەدەستچووم!

ئەم چارەنووسە تارەم تەنها لە چاوی بەدکارییەکانم دەناسی، مەگەر من بە بەدخووییەکەم لە ئاست دایکمدا سەرپێچی فەرمانی خوا، پاشان ڕێنمایی پێغەمبەر (د.خ) و، هەموو بەها مرۆڤانەکانم نەکردبوو؟

وەك منداڵ لە پەرستارەکان، نەخۆشەکان، تەنانەت کارگوزاری پاکوخاوێنیشدا دەپاڕامەوە، کە بەڵایەکم بەسەردا بهێنن، با بمرم.

ئاخر چۆن دەتوانم وەك مرۆڤێکی بێ ئومێد و بەم هەموو تاوانەوە بژیم؟ بمکوژن ...

هۆشم بە خۆمەوە نەماوە، دڵم بووەتە هەزار پارچەوە، ئاخر

نازانن ژیانی ئاوا وەك جەهەننەمی دونیاییە...

تا دەهات هەورە ڕەش و تاڵەکان زیاتر ئاسمانی ژیانیان دەتەنیم، لە پاش مەرگی دایکمەوە سات بەسات سزام دەچەشت...

کە لە نەخۆشخانە دەرچووم تەنها یەك گورچیلەم هەبوو و، تەندرووستیم زۆر کز و لاواز بوو. گیۆنولی ژنیشم، هەرچی دارونەدار و پارەی دۆزیبووەوە پێچابوویەوە و بردبووی و، خانووەکەشی فرۆشتبوو.. هەڵهاتبوو.. ئیتر هەر تەنها من و دەردەکانم مابووینەوە.

دەپاڕێمەوە ...

لەبەرئەوەی ئاگام لە کاروبارەکانم نەمابوو، لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا بەتەواوی مایەپووچ بووم.. بە نەخۆشیی و بێ پارەیی کەوتمە سەر کوچە و کۆڵان و شەقامەکان.

کوان ئەوانەی ڕۆژگارێك دەستیان بەسینەوە دەنا بۆم؟ کوان ئەوانەی دەیانوت وەك پەروانە لە دەورت دەبین؟ کوان ئەوانەی پڕوپاگەندەی عەشقیان دەکرد؟ کوان، هاوڕێکانم، دۆستەکانم، ئەوانەی وامدەزانی ئازیزمن؟ ... بەندەیەکی خودا بەدوامدا نەدەگەڕا و، لای لێ نەدەکردمەوە.. لە لووتکەی تەنهایی و بێ کەسیدا بووم.

پاش ئەوەی بە تاقە گورچیلەکەی دایکم زیندوو مابوومەوە، دووبارە تووشی خوێن بەربوونی ناوەکی بوومەوە و، بە کۆمەکی هاوڕێیەکی خێرخوازم لە نەخۆشخانە خەوێنرام.

ئێستا ڕۆژەکانی تەمەنم پەیوەستن بە داودەرمان و ئامێرەکانەوە، کێشی جەستەی (٩٠) کیلۆییم بووە بە (٤٠) کیلۆ.

بەکورتی ڕۆژەکان دەژمێرم، بەڵام بۆ کوێ؟

من کە خۆم شەرمەزاری بەر قاپیی خوا کردووە و، پشتم لە پەیامەکەی پێغەمبەر (د.خ) کردووە، مەگەر تەنها بەرەو ڕێی ئەو دۆزەخەی قیامەت مل بنێم، کە لەگەڵ هەر ساتێکدا هەست بە ئازار و سزاکانی دەکەم.. بەڵام هیچ نەبێت گەر لە ملیۆنێکیشدا یەك ئەگەری ڕزگار بوون و سەرفرازیم هەبێت، ئەوا ئەگەر بە زیکرێك بێت، یا بە دوعایەك لە خەیاڵمدا، چاوەڕێی ترووسکەیەکی ئومێد دەکەم.

بەهۆی نەخۆشییەکەمەوە هێواش هێواش خەریك بوو بینایی چاوەکانم لە دەست دەدا، ئاخر هەر چۆن دونیای مەعنەویم کزەڕۆشناییەکی تێدا بەدی نەدەکرا، هەرواش خەریك بوو دونیای ماددیم تاریك دابێت. هەمیشە ئامادەم بۆ پێشوازی فریشتەی مەرگ!

ئەوانەی ئەم بەسەرهاتە خەمناکەی من دەخوێننەوە، یا هەواڵێك لە ژیانم دەبیستن، ئەو گەنجانەی ڕووکەشی ژیان بە هەموو شتێ دەزانن، تکایە باش گوێم بۆ ڕادێرن، لە ئەزموونی ئەم ژیان تاڵەمەوە دوو ڕستەم هەیە بۆتان، تکایە لە دڵتاندا هەڵی بگرن و، لە یادی مەکەن: "بیرتان نەچێت، هەموو ژنانی دونیا کۆببنەوە، بەقەد دایکتان خۆشەویستی و سۆزتان پێشکەش ناکەن؛ هەموو پیاوانی

دونیاش کۆببنەوە وەك باوکتان میهرەبان نابن بۆتان."

باشترین و بەرفراوانترین سامان و دەوڵەمەندی دڵخۆشکردنی دایك و باوکە، بردنەوەی نزاکانیانە. خودا بەهەشتی لەژێر پێی دایکان داناوە، ئەوەی دڵ و هەستی دایك و باوکی ڕانەگرێت، دەرگاکانی بەهەشتی بەسەردا دادەخرێت. منداڵ و نەوەی ژیر، ئەم دوو کەسە ڕازی دەکات و، تاقیکردنەوەی ژیان بەسەرکەوتوویی تێدەپەڕێنێت و، دەرگاکانی بەهەشت بەسەر خۆیدا دەکاتەوە.

من ئێستە ئەم چوار دێڕەم کردووەتە ویردی سەرزمانم:

دایك تاجی سەرتە

دەرمانی هەموو دەردێکە

ڕۆڵە چەندێك پیریش بێ

پێویستی بە دایکیەتی

سەرەڕای هەموو هەڵەکانم، گوناهەکانم، بەردەوام داوای میهرەبانی لە خوای گەورە دەکەم و، خەیاڵی تروسکەیەکی کزی هیوا دەکەم، لەبەرئەوە تکایەکم لێتان هەیە:

بەدڵ دەپاڕێمەوە و هیوادارم شاهید بن بەسەر هەموو ئەو ئازارانەی چەشتوومن، ئاخر من وا وەك مۆم لەپای هەڵەو گوناهەکانم دەتوێمەوە، بەڵام هەر تەوبە دەکەم و، بەردەوام پەشیمانی دەچێژم.. تەنها ئومێدم شاهیدیی ئێوە و دوعای خێرتانە، بەڵکو بەوە دەرگاکانم بەسەردا بکرێتەوە، کێ دەزانێت ڕەنگە دوعای یەکێکتان

ببێتە هۆی لێخۆشبوونم.

تکایە تا لە ژیاندام و، فریشتەی گیانکێشان لە دەرگای نەداوم و، زمانم گۆدەکات و، بینایم لەدەست نەداوە و، بیروهۆشم سەلامەتە... دەستەکانتان بەرز بکەنەوە و، ببنە تکاکارم، تا لە سزای دۆزەخی ئەو دنیا ڕزگارم بکەن. بەم برایەتان -کە لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدایە- مەڵێن: "چی چاند با بیدووریتەوە" و، ئێوەیش پشتم تێ مەکەن. میهرەبان بن، بڵێن: "تۆبەی کردووە و، داوای لێخۆشبوون دەکات"، تکای ئەم بێچارەیە ڕەت مەکەنەوە و، دەست بەڕوویەوە مەنێن. لە ڕۆژی دواییدا، لە حزوری خوای گەورەدا، لە کاتی لێپرسینەوەی مندا بڵێن: "ئێمە شاهیدی تەوبە و پەشیمانیی ئەم برایەمانین!"

تکایە.. ئازاری ویژدان وا لەناوم دەبات، ئێوەش ئەم تکایەم لەبیر مەکەن. بەهیوام خوای گەورە دوعاکانتان قبووڵ بفەرموێت.

لە کۆتاییدا، لەم ئەزموونانەی ژیانمەوە زۆر باش تێگەیشتم کە: مەگەر تەنها دایکم خۆشی ویستبم ... کەوایە ئێوەش، بە دڵسۆزانە و بەئەمەکەوە پڕ بەدڵ دایکتان خۆش بوێت، چونکە "گەر بگریت، تەنها دایکت بەدڵ لەگەڵت دەگری، کەسانی تر هەموویان بەڕووکەش هاوخەمن بۆت".

**له خوێنەرێکەوە ...**

مرۆڤ نازانێت لەسەر ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینە ئازار بەخشە بڵێت چی!

پێویستە چیرۆکی ئەو ڕۆڵەیەی دایکی زیز کردووە، ببێتە وانە و پەند و عیبرەت بۆمان.

هەر مرۆڤێکی ژیر، پێویستە لە سەرگوزشتەی ئازادەوە هەڵوێستەیەك بكات و، لە خۆی ڕابمێنیت و، لێپرسینەوەی دەروونی بکات ... ئەگەر دڵی دایە و بابە و بەساڵاچووانی شکاندووە، داوای لێبوردن لەوان و داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکات ...

نهێنی خۆشبەختی لە دونیا و قیامەتدا، بەدەستهێنانی دڵی دایك و باوك و، دوعای خێری ئەوانە.

هەروەها پێویستە هەرگیز لە میهر و بەزەیی خوای گەورە بێ هیوا نەبین.. لە دڵەوە هیوادارم خودای گەورە، ڕۆژێك دەرگای ڕزگاربوون لە ئازادیش بکاتەوە و، لەو ئازارانەی ڕزگاری بکات.

پەروەردگار بەندەکانی بۆ سووتان و سزا بەدی نەهێناوە.

هیچ شتێکی هێندەی بەندەکانی لا خۆشەویست نییە، کەواتە مرۆڤ چەندێك هەڵەکار بێت، بەڵام گەر تەوبە بکات و پشت بە خوای گەورە ببەستێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە -خوا یاربێت- بە ڕزگاربوون دەگات ... سوپاس بۆ خوا.

**سەلیم**

# پێرست

بەشی یەکەم



بەشی دووەم



بەشی سێیەم



بەشی چوارەم



بەشی پێنجەم

BIR EVLADIN FERYADI

# BENI BIR ANNEM SEVMIŞ

## HALİT ERTUĞRUL

ئەم ڕۆمانە..

سەرگوزشتەی ئەوینی پاکوبێگەرد و، بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤە سادە و دڵپاکەکانە لەگەڵ سەختیی و نشێوییەکانی ژیان و، چەواشەبوونی ڕۆڵە بێ ئەزموونەکانە بە ڕووخسارە فریودەرەکان و، ئاهوناڵەی دایکێکی فیداکارە بەدەست بێ ئەمەکیی و دڵڕەقیی ڕۆڵە تاقانەکەیەوە..

لەم بەرهەمەدا، شانبەشانی (ئازاد) بەنێو وێستگەکانی ژیانێکی پڕپەنددا گوزەر دەکەین و، دەرەنجامی بێ ئەمەکیی و پێ نەزانی نەوەکان لە ئاست دایك وباوکاندا تاووتوێ دەکەین..

تۆی خوێنەریش دەتوانیت لە ڕۆشنایی ئەم بەسەرهاتەوە خۆت هەڵبسەنگێنیت و، لە سەرچاوە سازگار و ڕاستەقینەکانەوە خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی هەڵبگۆزیت..


0-0179-0000-X




نرخی (٣٥٠٠) دینارە





ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

www.aramediacenter.com

info@aramediacenter.com